کریس دی ستوپ

جیڤارا کمال




# بازرگانیکردن بە ئافرەتانەوە لە ئەوروپا

# بازرگانیکردن بە ئافرەتانەوە لە ئەوروپا

## لیکۆڵینەوە و نوسینی ڕۆژنامەنووسی بەناوبانگ
## کریس دی ستووب

## وەرگێڕانی : جیڤارا کەمال

# بەشی یەکەم

## قوبرس ، دەفری خولاوە ، تیرۆرکردنی پادشای یانەی شەوان

فڕێیدە ( ئارنستۆ باسیل ) بە ( دیڤید رۆزنبرگ ) ی بەریتانیایی نەژادی وت ، ئەوەیان من لیی بەرپرسم تۆ تەنها ئەوەندەت لەسەر فڕێی بدەیت .
( باسیل ) ڕی جیهانی کۆمپانیای ( بهادوریان ) ی دەوڵەمەند بوو لە ( نیکۆسیا ) کە گەورەترین دابەشکەری ( هونەرمەندان ) ی یانە شەوانەییەکان بوو لە خزمەتکاران و سەماکەرانی ئافرەت و سۆزانی لە جیهاندا .
لەگەڵ ( رۆزنبرگ ) وتوویژی دەکرد ، رۆزنبرگ کارگێری نوی بوو لە ئەوروپا ، سەبارەت بە سەماکەریکی ( مەراکیشی ) هاتبوو و دەدوا کە ناردبویان بۆ ( ئەڵمانیا ) ، لەوە دەچوو شتیك رویدابیت چونکە بەریتانیەکە دەیوت : پیویستی بە نەشتەرگەری ( سك ) هەیە ، ئەو بە تەواوی پەکی کەوتووە و دوچاری برینیك بۆتەوە لە پشتیدا و لەسەر کورسیەکی گەڕۆکە قاچەکانی لە گەچدان . ( رۆزنبرگ ) کە وەك جانتل مان دەدوا لە باسیل نزیك بوەوە و وتی : کیشەکە لەوەدایە کە تاکو لە نەخۆشخانە بمینیتەوە دەسەلاتی من بەسەریدا کەم دەبیتەوە ، تویژەرە کۆمەلایەتیەکان پرسیاریان لیکردووە ، بەلام خەمت نەبیت لەماوەی مانگیکدا توانای رۆیشتنی دەبیت و دەست دەکاتەوە بەکارەکەی .

لە ژووری چاوەڕوانیــدا ویــنەی ( ئــارتین بهادوریــان ) هەڵواسرابوو کە تـاکو ئیسـتا چـۆنیەتی کوشـتنەکەی یەکـیکە لە نهینـیە گەورەکـان لە ( قـوبرس ) ئـارتین بهادوریان ڕی کارە هونەریەکان بـوو ، مـن لەوی بـووم لە گۆشـەیەکی ئەو ژوورەدا دانیشـتبووم ، دەمویسـت کەس هەستم پی نەکـات ، و داوام کـردووە چـاوم بە باسیل بکەویت . ئەو وایدەزانی هاوڕی لەگەڵ گروپیك لە کچانی سـەماکەری ( ڕۆمانیـایی ) هـاتووم . بەڵام وا دیــاربوو منــی بیــر چوبــوەوە ( ڕودولــف ) ی قەڵەو شـۆفیری ئوتومبیلەکەی لەسـەر لایەکـی پەنـجەرەکە دانیشـت ، ڕە ئینگلیزیەکە چەند وینەیەکی کچەکـانی گرت و چەند گریبەستیکی دەرهیناو وتـی : پیویسـتە بە گروپیکی سـەماکەری یاسـایی بناسـرین ، پاشـان بەمـلاولای خۆیـدا ڕوانیـی و وتـی بـا ناویـان بنیـین ، ( گروپی بالیی ڕۆدۆلـف ) . ڕۆدۆلـف شـانیکی بـادا وەك ئەوەی بەلایەوە گرنــگ نەبیــت ، ( گروپــی بــالیی ڕۆدۆلف ) بەنیازە لەریگەی کارگیڕە کۆنەکەی ( میـونخ ) ەوە بچــن بــۆ ئەڵمانیــا .بــاس لە چەنــد گروپیکــی دیکەش کرا بۆ هەریەکە لە ( مۆنتی کارلۆ و لەندەن و لۆکسمبورگ ) بەریتـانی نەژادەکە گرنگـی زۆری دەدا بە کچە ڕۆمانیەکان چونکە جوان بوون .

دورگەی ( قوبرس ) بە دەفری خولاوە دەژمیردریـت لە ڕۆژهەڵاتــی ناوەڕاســـتدا لە رووی بازرگـــانیکردن بە ئافرەتانەوە هەروەك خاڵی پەڕینەوەیە بەرەو ئەوروپـا . لیرە کچەکان دەهیڵنەوە تـاکو پیویسـتی کۆچکردنیـان بۆ تەواو دەکریت لە بەڵگەنـامە و پیویسـتیەکانی تـر ،

هەوڵ دەدەیـــن لەم مـــاوەیەدا تـــرس و شـــەرمیان بشکینین لەسەر راهاتن بۆ کاری داهاتویان ( ئەمە قســـەی بازرگانەکـــانی ســـیکس ) ە ، ئەم دەوڵەتە بچکـــۆلەیە کە ســـەرجەم دانیشـــتوانەکەی ( 600 ) هەزار کەسـە ( 100 ) هەزار یـانەی شـەوانی تیـدایە کە بە ( کەباری ) یان ( بـوزوکی ) ناوەبریـت تیایانـدا دەنگـی مۆســیقای میللـی قوبرســی دەبیســتریت لەگەڵ نمایشـــکردنی ( پیشـــانگای جیهـــانی ) بە واتایەکی دیکە و وەك من بینیم ئافرەتانی ( فلیپینی ) رووت !
بەڵام پـــاش کەوتنـــی پەردەی ئاســـنین / الســـتار الحدیـــدی و لەپـــاش ئەوەی کە کاربەدەســـتانی ئافرەتانی گەنم رەنگ بیزاربوون ئەنجا ( قوبرس ) بووە ناوەندی ( هاوردە / استیراد ) کردنی سپی پیست و مـــوو زەردەکـــان کە لە ئەوروپـــاوە دەهینـــران پـــاش روخاندنی شیوعیەت بە ساڵیك ( هەنگاری ، بولگاری ، پۆلۆنی ) یەکان بەتەنهـا نیـوەی کچـانی پیشـاندراو پیکدەهینن لە ( قوبرس ) .
زوربەی هەرە زۆری ئەو یـانە شـەوانەییانە خـودی خۆیـــان هەڵســـورینەی ئەو بازرگـــانیەن . ئەمـــانە کچەکانی وڵاتانی خۆیـان بە گریبەسـتی کـارکردن بـۆ مـاوەی دوو سـاڵ رادەکیشــن ، لەکاتیکـدا نـاتوانن لە شـــەش مانـــگ زیـــاتر لە قـــوبرس کـــار بـــکەن . بەڵام قازانجی زۆر و وەدەسـتهینانی سـامانی زۆر لەوەدایە کە ئەم گروپـانە بفرۆشـــرینە وڵاتیکـــی تـــر ، لەپـــاش تیپەبـوونی شــەش مانـگ و لەوکـاتەی ئەو کچـانە لە

چاوەڕوانیــدان بــۆ گواســتنەوەیان بەرەو ئەوروپــا بە دەستبەسەر دەمیننەوە و زۆریان لی دەکریت لە یانە شــەوانەییەکانی ( نیکۆســیا و لارنکــا و لیماســۆل ) جەســتەی خۆیــان نمــایش بــکەن و لەشفرۆشــیش ئەنجام بدەن ، چونکە دانیشــتوانی ئەم دورگەیە هەر بە کیشــانی ( نیــرگەلە ) وە نەوەســتاون و بەڵکــو بەهــۆی پــارەو پولیــانەوە ئەتــوانن لەگەڵ کچــانی بیانیشــدا ســیکس بــکەن ، ســەربازەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان لەگەڵ ئەو بنکە بەریتانیەی لەو وڵاتەیە لە هەڵســوڕینەرانی ئەو کــارەن ، ئاشکراشــە کە قوبرس لە دوای هەشتاکانەوە لەرووی هاوینەهەوار و گەشــتیاریەوە بەرەو پیشــچون و گەشــە کردنیکــی بەرچــاوی بەخــۆوە بینــی ، کە زوربەی میــوان و گەشتیارەکان لە ئەوروپایی و عەرەبەکانن ، هەندیك لەو یانە شەوانییانە نرخەکان بە زمانەکانی ( یۆنانی و ئینگلیــزی و عەرەبــی ) دەنوســیت . یەکیــك لەو میوانانەی بەشــیوەیەکی بەردەوام ســەردانیان هەیە بــۆ ئەو یانــانە لە ئامۆژگاریەکیــدا وتــویەتی بــۆنی ( Drakar noir ) بەکارمەهینە چونکە کچەکان دەترسن لەبەرئەوەی پیشــتر ئەو بــۆنە عەرەبەکــان بەکاریــان هینــاوە ، ریژەیەکــی زۆر عەرەب بەهــۆی ئەوەی لە وڵاتــانی خۆیــان لەو جــۆرە یانــانەی تیــدا نــیە دیــنە ( قوبرس / دورگەی خۆشەویستی ) بۆ دەســتکەوتنی خۆشــیەکانیان بەمجــۆرە قــوبرس خــۆی بەخــۆی دەفرۆشیتەوە .

نازناوی ( قـوبرس / دورگەی خۆشـەویسـتی ) بەپـی ئەفسانە یۆنانیەکان دەگەڕێتەوە بۆ( ئەفرۆدیت ) ی خوای جوانی و سك کە لە قوڵایی دەریادا لەدایکبـووە دوای ئەوەی کە کـوڕی ( ئۆرانـۆس ) ی خوداوەنـدی گەورە کۆئەندامە سیکسیەکانی باوکی لیکـردۆتەوە و خستویەتیە دەریاوە .

قـوبرس لە پەنجاکـانەوە بە ناوەنـدی بازرگـانیکردن بە ئافرەتـانەوە ناسـراوە، لەوکـاتەی ئەوروپـا کیشـەی ( بازرگـانی سـپی پیسـت ) و ناردنیـانی بـۆ وڵاتە عەرەبیەکان هەبوو .

( ستیڤان بارلی ) رۆژنامەنووس لە کتیبیکیـدا بەنـاوی ( Bondag ) نوسـیویەتی کە قـوبرس بە قوتابخـانەی سـەرەتایی کۆیلایەتی سیکسـی دادەنریت ، کتیـبەکە باسـی لە هەمـان ئەو گـروپە هونەرییـانە کـردووە کە تەنها بە مەبەستی سیکسـی و لەشفرۆشـی لەژیـر نـاوی سـاختەی ( تیمـی هـونەری ) کە پیشـتر باسـمانکرد بەڵام بە پـیچەوانەوە بازرگـانیەکە لە ئەوروپایەکی هەژاری کەوتووی دوای کۆتایی جەنگـی جیهانی دووەم بەرەو رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و بـاکوری ئەفریقا گواسـترایەوە . بـارلی لە کتیبەکەیدا بـاس لە ڕیکـی بەلجیکـی دەکـات کە گروپیکـی پیکهـاتووی لە هەشـت سـەماکەر لەدەستداوە ، پاش چەنـد سـاڵیك دوانیان دۆزرانەوە کە دووچـاری نەخۆشـی سیکسـی ببـون یەکیکیـان ڕاسـتەوخۆ خـۆی دەکوژیـت و ئەوی تـریش رەوانەی وڵاتیکـی بیـانی دەکریـت بە نهینـی ، ئەم دوو کـچە لە خـانویەکی تـایبەتی شـەوانە لە (

ســـــوریا ) هەڵهـــــاتبوون . ئەو مەرجـــــانەی لەو گریبەستانەدا هاتبوون خالیکیان بریتی بـوو لەوەی کە ( پـارە نـیە بـی زەحـمەت ) واتە هەر ئافرەتیـك ، یـان کچیك کە لە یانە شـەوانەییەکاندا کاردەکـات پیویسـتە بەتەواوی خۆی مانـدوو بکـات بەهەمـوو شـیوەیەك لە هەمـوو رویەکەوە تـا کـریکەی خـۆی وەرگریـت بەپیـی پیویستی و داوای یانەکە ، ئەمە یەکیك بـوو لە بنەمـا سـەرەکیەکانی ناوەوەی ئەم کـارەو و هەر کچیـك گەر بیویســــتایە ئەو گریبەســــتە هەڵوەشــــینیتەوە ئەوا روبەروی قەرزیکی زۆر دەبیتەوە ، واتە کڕین و فرۆشـی ئەو کچـــانە بەدەســـت گەورە و بەرپرســـەکانیانە ، کۆمپانیای ( بهادوریان ) لە پەنجاو شـەستەکاندا رۆڵی کــارا و گرنگــی دەگیــڕا لە بازرگــانیکردن بە ســـپی پیســـتەکانەوە . لەســـەردانی دووەممـــدا بـــۆ ئەو کۆمپانیایە (ئارنستۆ باسیل)م بینی لەگەڵ ( شـاهین ) ناویـــــك کە بە رەچەڵەك عەرەبە و لە لوبنـــــان دادەنیشـــیت و یەکیـــك بـــوو لە ڕە هونەریەکـــان ، هەردووکیان بەیەکەوە سـەرنجی نەخشـەی جیهانیان دەدا کە بە دیوارەکەوە هەڵواسرابوو ، بەشیوەیەك کە ئارنســتۆ دەتوانیــت بزانیــت لەکــوی و چەنــد جــیگە کچەکـــانی بڵاوکـــردۆتەوە ، تەلەفۆنەکەشـــی بە بەردەوامــی لیــی دەدا و لەکــاتی هەڵگرتنیشـــی کۆمەڵیك قسـە و وتەی ناشـرینی بە قسـەکەری نـاو تەلەفـۆنەکە دەوت وەك گلەیـیەك لە کەســـانیك کە پیشـــەکی کەمیانـــداوە لە بەرامـــبەر کچەکانـــدا . ( ســــکرتیریك ) هەبـــــوو ویـــــنەی ســــــەرجەم

( پاسـپۆرتەکان ) ی دەگـرتەوە و لەسـەری دروسـت دەکرایەوە بـۆ هەمـوو وڵاتـانی جیهـان ، ( فریکسـۆس بلاکیدس ) ڕی کاروبـاری نـاوخۆی کۆمپانیـاکە بـوو کە دەفتەر و تۆماری گەورەی لابوو بەناوی کچەکان و یانە شـەوانەییەکان ، لەو ژوورەداو لەسـەر پـارچەیەك بە خەتیکـی گەورە نوسـرابوو ( وریـابە لەو کەسـانەی یارمەتیت داون ) رۆدۆڵفی سمیڵ زل کـچ لەدوای کـچ دەیکـردنە ژوورەوە بـۆلای ڕی نمـایش تـاکو لەش و لاریان ببینیـت و سـەیری وینەکانیـان بکـات تـا بزانیـت شیاون ، رۆدۆڵـف ناوبەنـاو دەیـوت : دەی کچەکـان بە نۆرە و بی کیشە بوەستن ، ئیش و کار لەوپەڕیدا بـوو لەکاتیکدا ( باسیل ) تەمەن پەنجا ساڵ دەیـوت : گەر ملیۆنیر دەبووم چیم دەکرد لیرە ، رۆژانە ( 12 ) کاتژمیر کاردەکەم .

پاشان ( شاهین ) ی عەرەب بۆی باسکردم کە چـۆن ( بەیروت ) لە رابردوودا ناوەندی ژیـانی شـەوانە بـووە لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاسـتدا و دەیـان یـانەی شـەوانەی تیادا بووە و تیایدا کچانی ( فەرەنسایی و سویسری و بەلجیکایی ) سەمایان دەکرد ، سەمای ( کـان کـان ) عەرەبیش لەسـەرجەم وڵاتـانەوە دەهـاتن بـۆ بینینـی سـەماکە و کڕینـی کچـان . ئەو سـەردەمە و پـیش ئەوەی بکوژریـت ( بهادوریـان ) بە پادشـای یـانە / کەبـاری ناسـراوبوو هەروەك کۆمپانیـایەکی لە لوبنـان هەبوو لە ماوەی هەڵئایسانی جەنگی ناوخۆ ساڵانی ( 1970 – 1980 ) سەرجەم کارەکـانی گواسـتەوە بـۆ نیکۆسـیا و زۆرتـرین ڕانـی هـونەریش بەرەو قـوبرس

رۆیشـــتبوون و لەوی جیگیربووبـــوون و کارەکانیـــان لە بەیروت راگرت و داخست ، بەڵام پاش کۆتایی هاتنی جەنـگ سـاڵی ( 1990 ) جیهـانی یـانەی شـەوانە لەدایکبونیکی نویی بەخۆوە بینی ، بەڵام ئەمجـارە لە بەیـروت نـا بەڵکـو لە ( جـونیە ) مەسـیح نشـین کە شـاریکە لە دووری ( 20 کـم ) لە بـاکوری بەیروتـی پایتەخـت و ( 15 ) یـانەی شـەوانەی تیـدا کـرایەوە ، زوربەیان لەژیرزەمینی میوانخانەکاندا ، یان لە نهـۆمی باڵەخانەکاندا بـوون ( شـاهین ) خـاوەنی سـیان لەو یانـــــــانە بـــــــوو بە ناوەکـــــــانی ( Elcordobes , Paradies , La Taverne ) ئارنسـتۆ لە هەوڵداندایە نوسینگەیەك بکاتەوە لە جونیە .

بەهەرحـاڵ ناوەنـدی سـەرەکی ئەم بازرگـانیە لە ( قـوبرس ) ە کە نشـینگەی کاربەدەسـتان و ڕانـی گەورەیە و لەسـەرو هەموشـیانەوە ( بهادوریـان ) بە شـــــیوەیەکی یاســـــایی نـــــاوی ( Artin Bahadorian Successors Ltd ) هەڵگرتـووە لەبەرئەوەی هاوڕییـان و ئەو کەسـانەی لەگەڵیـدان کۆکن لەسـەر ئەو نـاوە و بەلایـانەوە پەسـەندە تەنهـا وەك ناو چونکە کەس خۆشـی نەدەویسـت و کچەکـان بە ( بـابە ئـارتین ) ناویـان دەبـرد ، کاتیـك کوشـتیان سـەرجەم کەناڵەکـانی T.v قـوبرس بردنـی تەرمەکەیان پیشانداو بینیان چۆن کچانی ( فلیپینی ) دەگریـان ، ئارنسـتۆ باسـیل حەز بە باسـکردنی ئەم باسە ناکات . ئەوە تەنها رووداویك بوو ، دزەکە چوبووە ژوورەوە و بەشـوین کلیلـی قاسـەکەدا گەڕابـوو کە

خشڵ و زیڕی کچەکان و چەند زەرفیك پارەی تیدابوو ( ئارتین ) بەهۆی ئازاریـك لەپشـتیدا نەیـدەتوانی ملـی بجوڵینیت و دزەکەش ملی گرتبوو و رایتەکانـدبوو تـاکو شـکاندبووی و بەهۆیەوە ئارتین گیانی لەدەسـتدابوو ، پـاش دەسـتگیرکردنی ئیسـتا دزەکە بە هەتاهەتـایی زینـــدانی کـــراوە ، بەڵام بە وتەی رۆژنامەنووســـیکی قوبرســـــی کە لە رۆژنــــامەی ( Cyprus Weekly ) کاردەکات بڵاوی کردبوەوە کە گوایە بکوژەکەی ئـارتین بەکـــری گیـــراوە ، باســـی دزیەکەشـــی تەنهـــا بـــۆ داپۆشـــینی تـــاوانەکەیە ئەوکـــات پـــۆلیس لەبـــارەی کیشــەکەوە دانــی بەوەدا نـابوو کە تـاوانیکی تەواوە و لاشـەی ( بهادوریان ) ی تەمەن ( 64 ) سـاڵ لەلایەن یەکیك لە فەرمانبەرەکانی خـۆیەوە لەبەرەبەیـانی ( 1 ت 2 )ســـــاڵی 1986 دۆزرایەوە ، بەپیـــــی راپـــۆرتی پزیشــکیش ( ئـارتین ) خنکینـراوە و پاشــان خــراوەتە ســەر سیســەمەکەی خــۆی و قاســەکەش بــڕاوە . پادشـای یانە شـەوانەییەکان بە چەند کاتژمیریك پـیش کوشــــتنی لەگەڵ یــانەی شـــەوانەیی ( لیـــدۆ ) ی فەرەنسایی وتوویژی کردبـوو سـەبارەت بە سـی کـچ کە داواکرابـــوون ، دزەکە هـــیچ شـــتیکی وای جـــی نەهیشـتبوو کە دەموچاویك و جووتیك دەسـتکیشـی لە دەســـتدابو بـــوو تـــاکو بـــدۆزریتەوە ، لە ( 17ی ت2 ) هەمان ساڵدا خشـڵ و زیـڕە دزراوەکـانی کچەکـان لە رووداویکی ئوتومبیلیکی سـوتاودا دۆزرانەوە . لە دوای دوو مانـگ ئـافرەتیکی دەوڵەمەنـد بەنـاوی ( ماریــــــاتیلۆنی ) بە کلاشـــــینکۆف لە ( 15 ی ك2 )

دەكوژریـــــت و پـــۆلیس ڕووداوەكەی بە بكـــوژیكی بەكریگیـــراو لە قەڵەمـــدا ، هـــاوڵاتیەك بەشـــوین بكوژەكانـــدا رادەكـــات و لەبەرئەوەی تەقە لەویـــش دەكەن بە ناچاری دەگەڕێتەوە و بەهەر شیوەیەك بیت ژمارەی ئوتومبیلەكە دەگریت بۆ رۆژی دواتر بكوژەكـان كە بریتی بوون لە سی پیاو دەسـتگیركران یەكیكیـان بە نازنـاوی ( یـوراكیس ) واتە ( لە یاسـا یـاخی بـوو ) كـاتی خـۆی لە بەنـدیخانە بەگیـل و سسـتی لە ئیشـەكانیدا تاوانبار دەكریت و هەڵـدیت و دوای خـۆ بە دەستەوەدانی و ئازادبوونی بەهۆی پاریزەرەكەیەوە بە پاڵەوانیكی نیشتمانی ناوی دەركرد .

لەسـەردەمی لاویتیدا ( یوراكیس ) بەشـداری فیلمیـك دەكات بەناوی ( ماكاریوس ) و تیایدا رۆڵی سـەرۆكی دەبینی و باسـی لە ژیانی دەكرد، بەهۆی دانپیادانانی یەكیك لە هاوكارەكانی كە لە گەڵیدابووە لە كوشـتنی ئافرەتە دەوڵەمەندەكە ، لەلایەن پۆلیسـەوە دەسـتگیر دەكریت و بە كوشـتنی ( بهادوریان ) تاوانبـار دەكریـت كە پیشـــتر خـۆی بـۆ ئامـادەكردووە و نەخشـــەی بـۆ كیشاوە و خەڵكانی ئەنجامدەرانی ئەم كـردەیەش تـا ئیسـتا نادیارن .

بەپیـی وتەی رۆژنامەنووسـیكی رۆژنـامەی ( Cyprus Weekly ) لەپـاش ئەوەی ( ئەنتەرپـوڵ ) هـاتن بەدەم ئەم رووداوەوە و لیكۆڵینەوە لیی و دوای ئەوەی چەنـد بەڵگەنـامەیەكی تـایبەت بەبیرەوەریەكـانی ئارتینیـان دۆزیەوە ئاشـــكرابوو كە ( بهادوریـــان ) كۆمپانیـــایەكی

گەورەی لە بەڕیـوەبردنی هـونەری تەکنیکـی بەڕیـوە دەبات لە جیهاندا لە بازرگانیکردن بە ئافرەتانەوە .
( بهادوریان ) کابرایەکی نەخۆشـی سـەرکورسـی بوو ، سـاڵی 1922 لە ئاسـیای بچـووك تورکیـای ئیسـتا لەدایکبووە ، پاشان لەگەڵ خیزانەکەی بەرەو قـوبرس دەچیت و جیگیردەبیت و هەر لەوی دەست بەخویندن دەکـات لە قوتابخـانەی ئینگلیـزی بەناوبانـگ لە ( نیکۆسیا ) لەساڵی 1952 کۆمپانیایەك دادەمەزرینیـت کە بە خیراییەکی بەرچـاو گەشـە دەکـات و لەلایەن ( 12 ) ڕەوە بەڕیـوە دەبـرا و (2000 ) کـچ تییـدا دەسـت بەکـاربوون کە سـەرجەم دابەشـکرابوون بەپیـی گریبەست لەنیوان ئەوروپا و رۆژهەڵاتـی ناوەڕاسـتدا ، نوسینگەشـی لە هەریەك لە ( مـانیلا و بەیـروت و ئەنـقەرە و قـاهیرە بەغـداد و تـاران ) هەبـوو ، ئەو سـەردەمانە ئیران بـازاڕیکی گەرم بـوو بەهـۆی ئەوەی ریژەیەکـی زۆر لە ( ئەرمەن ) ی تیـدا دەژیـا ، بەڵام شۆڕشـی ئیسلامی لە 1979 دا سـەرجەم ئەم بازاڕ و یانانەی داخست ( ئارتین ) بی منـداڵ مـابوەوە منداڵی نەدەبوو لە ژنەکەی ، کاتیك لە ماڵەوە دەهاتە دەرەوە سی کچـی لەگەڵـدابوو ، بە وتەی ئەو کچـانە هەرکاتیـك تووشـی هەر کیشـەیەك بهاتنـایە ئەم رزگـاری دەکـردن ، بەڵام ئەمە ئەوە ناشـاریتەوە کە بەهـۆی ئەو کچـانەی بە کچـی خـۆیی دەزانـین سـامانیکی زۆری کۆکردبـوەوە ، لەپـاش مردنـی منـداڵانی بـراکەی کارەکـانی وەك ( بەش / حصـص ) دەفرۆشـنە ( فریکسـۆس

بلاكیـــدس ) بەریـــژەی ( 9.999 ) و یەك بەش بـــۆ ژنەكەی ، بە هـیچ شـیوەیەك و هـیچ كاتیـك نـاوی ( ئارنســتۆ باســیل ) لە بەڵگەنــامە و گریبەســتەكاندا دەرناكەویـــت كە هەڵســـوڕینەری ســـەرەكی ئەم كۆمپانیپــایەیە و پەیوەنــدی پــتەوی هەیە لە تەواوی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا و زۆرچاك ناوبـانگی دەركـردووە و ناسـراوە ، كاتیك وەزارەتی كار نوینەریكی خۆی لە ( فلیپــین ) دەنیـریتە قـوبرس تـا لە ژیـانی ئەو كچـانە بكۆڵیتەوە كە بەناوی گروپـی هـونەریەوە كـاردەكەن ، ئەو نـــــوینەرە لە باڵەخـــــانەی ( بهادوریـــــان ) نوسینگەیەكی بۆ تەرخانكراوە كە ئەوە دەگەیەنیت تـا چەند حكومەتی فلیپین هاوكـارە لەو كـارەداو ریگەیـدا كە ( ئارتین ) نازناوی ( قونسوڵ ) ی فلیپین وەرگریت لەپاش مردنیشـی بە رەسـمی نازناوەكە درایە پـاریزەر ( P.erotocritou ) ی ناسـراو لە جیهـانی سیكسـدا .كابرایەكی شۆرشگیڕ و دینامیكیە ، هەر بۆیە لەپاش وەرگرتنی ئەو نازنـاوە فـایلیكی گەورەی بە پیشـنیار و كیشـەی كچە فلیپینیەكان كردەوە سـەبارەت بە رەقی مــامەڵە كردنیــان لەلایەن بەرپرســانی كارەكانیــان زۆرلیكردن لەخۆ فرۆشـی و نەدانی كریی تەواو پییان ، زۆرجــار ئەم پــاریزەرە روبەڕوی هەرەشــەی كوشــتن دەبوەوە لەلایەن كەسانیكی نە ناسـراوەوە لەبەر ئەوە ناویریت سـوار هیچ جۆرە ئوتومبیلیك ببیـت لە ترسـی كوشـتن چونكە ئوتومبیلی مینریژكراو زۆرتـرین هۆكـارە بۆ كوشـتن .

ئەم پـاریزەرە دەڵیـت ( قـوبرس ) نەژادەکـان بازرگـانی چـاوچنۆکی ئەم کـارەن لە رۆژهەڵاتــی ناوەڕاســتدا ســـــامانیکی گەورەیـــــان بەدەســـــتهیناوە لە روی ئابوریشـەوە بەتـایبەت پـاش کۆتـایی هـاتنی جەنگـی نیـــوان تورکیـــا و یۆنـــان ، ئەوەبـــوو ئەم دورگەیە کە ژیردەســـتەی ئیســـتعماری ئینگلیـــزی بـــوو بـــووە ناوەنــدیکی پەڕیــنەوەی ( چەك و تلیــاك و ئــافرەت ) چــونکە ئەم دورگە دڵــرفینە بە پردیــك ناودەبریــت لە نیـــوان رۆژهەڵات و رۆژئـــاوادا و پـــارە و خۆشـــیەکان بەڕیــوەی دەبەن و باشــترین شــوینە بــۆ هەر جــۆرە بازرگانیەك تەنانەت دۆزەخیەکانیش .

تەنها ئەم ڕانە لە هەڵسورینەرانی بازرگـانی ئافرەتـان نین بە تەنها ، بەڵکو خـاوەن میوانخانەکـان و تەنـانەت شـۆفیری ئوتومبیلی کـریش هەمـان بازرگـانی پەیڕەو دەکەن ، چەنـــد نـــاوچەیەکیش هەیە کە ئەم جـــۆرە کارانەی تیدا قەدەغە کـراوە لەلایەن پیـاوانی ئـاینی ( ئەرسو زوکس ) ، گەربیت و ئافرەتیـك بـۆ سـکاڵا پەنـا بەریــتە بەر ئەوان کە میــردی لەگەڵ کچیکــی بیــانی سـیکســی کردبیــت پیویســتە ئەو کـچە نایاســاییە لە وڵات دورخـــــریتەوە ، پـــــاریزەر ( P.erotocritou ) لە قسەکانی بەردەوام دەبیت و دەڵیت : بەڵام ( مافیـا ) دەســـتیکی بـــاڵای هەیە لە هەڵوەشـــاندنەوەی ئەم بڕیارانە چونکە کاتیك ئەو داوای کردبوو ( فیزا ) بـدریتە چەند کچیکی فلیپینـی تـا وڵات جـی بهـیڵن داواکەی رەتکرایەوە لەلایەن بەرپرسـانی حکومەتی ( قـوبرس ) کە ئەویـــش ئەوە دەگەیەنیـــت بەرتیـــل دراوە بـــۆ

هەڵوەشــاندنەوەی ریــگەدانەکە ، کە زوربەی لەلایەن مافیاوە ئەنجـام دەدریـت یـان بەهەمـان شـیوە کاتیـك پــۆلیس یــانەیەکی شـــەوانەیی دادەخــات پیویســـتە بزانریت لەلایەن خاوەن یانەیەکی تـرەوە بەرتیـل دراوە تـــا ئەو یـــانەیە دابخریـــت ، ئەم پـــاریزەرە دەڵیـــت : بەرپرســـــانی حکـــــومەت لە هەڵســـــورینەرانی ئەم بازرگــانیەن لەبەرئەوەیە گەربیــت و مــن داوایەك بەرز بــکەمەوە راســتەوخۆ دەیــدەمە پــاریزەری پــایەبەرزی گشتی نایدەمە پۆلیس کە ( Nicoc zavros ) ڕیتی و هاوکارەکەشـــی دووەم کەســـە لەگەڵیــدا بەنــاوی ( Yenakis Loannou ) ڕی تەکنیکی ئەم بازرگانیەن لە قوبرس .

لەو ماوەیەی کە ( بهادوریان ) تیایدا کوژرا ( ئایانۆ 9 ی هاوڕیی ســەرۆکی پــۆلیس یەکیـك بـوو لە نـاودارترین ڕانــی ئەم کــارە لەو ســـەردەمەدا ( ئیرۆتۆکریتــۆ ) ی پــاریزەر ئەوکــات ســی ســکاڵای لەبەردەســتدابوو کە لەلایەن ( 3 ) لە کچــانی یــانەی ( مۆنــت کــارلۆ ) لە ( لیماســۆل ) بەرزکرابــونەوە لەدژی ڕی ئەو یــانەیە کە کریـی تەواو نـاداتە ئەو کچـانە و هاوکـات زۆریـان لـی دەکات کە گەر نەیانتوانی بیسەلمینن کچن و پەردەی کچینیان ماوە دەبیت لەگەڵ میوانی یانەکە پەیوەنـدی سیکســـی ئەنجـــام بـــدات ئەمە جـــگە لەوەی وەك دەستبەســەر مامەڵەیـان دەکریـت پارەیـان نـاداتی لە سیژەم خواردن زیاتر نەبیت .

دوای ئەوەی سکاڵایان تۆمارکرد لای پۆلیس ( ئایـانۆ ) بەم کارەی زانی و لە بیزاریدا پریاریدا بگویزرینەوە بـۆ (

مـانیلا ) یەکیـك لەو کچـانە شـەو تـا بەیـانی بەسـەر شـــەقام و کۆڵانەکانـــدا دەســـوڕایەوە و نەیـــدەویرا بگەڕیتەوە بۆ ( شـوققە ) کەی لە ترسان .
بــۆ رۆژی دواتــر هــاوڕییەکی ڕ ئامۆژگــاری کــردن کە کەلۆپەلیـــان کـــۆبکەنەوە و بەرەو ســـنوور بـــڕۆن کچەکانیش بە قسەی دەکەن و ئەرۆن بەڵام ڕ درکیان پـــی دەکـــات و بە دز تاوانباریـــان دەکـــات و لەلایەن پۆلیسـەوە لەسـەر سنوور دەستگیر دەکرین .
( نیکـۆس زاڤـرۆس ) ســەرۆکی پۆلیســی بیـانی لە قوبرس کە بە کابرایەکی زۆر بڵی ناوبانگی دەرکردبـوو ئەو کات شـەش مانگا مابوو ۆب خانەنشینی دەڵیت : کیشـەی کچە فلیپینیەکان ئەوەیە کاتیك سـکاڵا تۆمـار دەکەن و بەنــد دەکــرین لە دادگـا وتەکانیـان دەگــۆڕن زاڤـرۆس وەك ئەوەی درۆ لەگەڵ خۆیـدا بکـات ئەیـوت من نـازانم ئەم نەگبەتـانە لەدوی چـی دەگەڕیـن ؟ ... بەردەوام لیکۆڵینەوە ئەنجام دەدەین تا بـزانین کە ئەم کچـــانە هـــونەری و هونەرمەنـــدی راســـتەقینەن و هەمووشـیان کاتیك دەگەنە قوبرس لەلایەن پزیشـکی تایبەتمەند پشـکنینیان بۆ ئەنجـام دەدریـت تـا بزانریـت نەخۆشـی سیکسیان نیە بەتایبەت ( ئییدز ).
بەپیــی وتەکـانی زاڤـرۆس ڕی یانەکـان توانـای دانـی پارەی بلیتی فرۆکە و کریی خانویـان نـیە لەبەرئەوەی کچەکـــان رۆژانە تەنهـــا ( 15 ) پاوەنـــدی قوبرســـیان دەستدەکەویت . کە بڕیاربووە ئەو کچانە مانگانە بـڕی ( 300 ) دۆلار وەربگرن جگە لەوەی کە بـڕی ( 10% ) ی نرخـــی خواردنیـــان هەیە لەگەڵ خـــواردنەوە بەڵام

کڕیی سی مانگی یەکەم و سەرەتا وەرناگرن لەگەڵ ئەوەی زۆریان لیدەکریت چەند پسولەیەك بە وەرگرتنی ئەو بڕە پارەیەیان وەرگرتووە ، پاشان لەشیوەی بەش بەشدا پارەی تریان لی وەردەگیریت کە لە کۆتاییدا کچەکان پارەی بلیتی فرۆکەیان بۆ نامینیتەوە تا لە کۆتایی مانگدا بگەڕینەوە وڵاتەکانیان ، چونکە لەلایەن ڕی یانەکانیانەوە بلیتەکانیان رەتدەکریتەوە و پاسپۆرتەکانیشیان هەڵدەپەسیردریت و وەك پیشتر باسمکرد گەر نەتوانن بیسەلمینن کچن زۆریان لی دەکریت کاری لەشفرۆشی ئەنجام بدەن لە میوانخانە و ناو ئوتومبیل و تەنانەت لە ناو باخ و باخچە بۆ ئەوەی نزیکەی ( 20 ) پاوەندی قوبرسی وەرگرن کە تەنها ( 10 ) بۆ خۆیانە .

ئایانۆی هاوڕیی ئازیزی زاڤرۆس ئەم سیاسەتە پەیڕەو دەکات ، چونکە ئەم شارە دڵرفینەی کەنار دەریا کە نازناوی ( بەلۆعەی دۆزەخە ) وەك حەشارگەیەك وایە بۆ ژمارەیەکی زۆر لە عەرەبەکان بەتایبەت عەرەبە لوبنانیەکان لە نزیك ( گۆڕەپانی دلیران ) دەیان یانەی شەوانە و شوینی خواردنەوەی مەی و ( 3 ) چیشتخانەی فلیپینیشی لییە .

لە یەکیك لە شەقامەکاندا چیشتخانەیەکی بەناوبانگ هەیە بەناوی ( ڤینۆس ) شوینیکی ئیجگار پیسو پۆخڵە و بریتیە لە هۆڵیکی تاریك خاوەنەکانی لە قوبرسیە سمیڵ زلەکانن . بەو پییەی چوبووم چاویك بگیڕم و چەند پرسیاریك بکەم لەگەڵ کچیکدا بەناوی ( ڤینیسا ) پاڵیکیان پیوەنام تا بچم خواردنەوە

بخۆم و شوشـەیەك ( شـامپانیا ) ی بۆ بکـڕم ، پاشــان کردینیانە ریـڕەویکەوە جـگە لە بەردەم خۆمـان نەبیـت هـیچ شــتیکی ترمـان نەدەبینــی هینــدە تاریـك بـوو . ئەنجـا ڤینیســای تیـوەگلاو و ونبـوو باســی خـۆیی بـۆ گیرامەوە کە چۆن هـاتۆتە قـوبرس بەر لە ( 5 ) مانـگ لە ریــگەی ( بۆمبــۆس میکائیــل ) ناویــك کە بە ( بابــا بۆمبۆس ) ناسـراوە ، ئەویش پاش ئەوەی ئەم کابرایە لە فلیپین چۆتە ئەو جیگەیەی تـایبەتە بە سـەماکردن بە جلوبەرگی چنـراو لە گەڵای داری مـۆز و دواتـر ئەم کـابرایە چەنـد گریبەســتیکی بەبـڕی ( 350 ) دۆلاری مانگـــانە ئیمـــزا کـــردووە لەســـەر ئەم کـــچە ، کە لە مانگەکـانی سـەرەتادا هـیچ پـارەیەکی وەنەگرتـووە . دواتر وای لیهاتووە کاتیك پۆلیسیك بۆ کاری سـیکسـی دەچیـتە ئەم یـانەیە ئەم کـچە دەستنیشــان دەکـات کردەی سیکسـی لەگەڵدا ئەنجام بـدات و لەو کـاتەدا پـــۆلیس ئەدات بەســـەر یـــانەکەدا و چیشـــتخانەکە دادەخریت ، بەڵام دوای دوو مانگ دوبارە دەکـریتەوە و ئەم جارەیـان لەژیـر نـاوی ( یانـاکیس ئایـانۆ تـورکی کلاسیکی ) لە جیاتی ڤینـۆس لەم مـاوەیەدا ڤینیســا هیچ پارەیەکی وەرنەگرتووە چونکە بەپیی بەنـدەکانی گریبەســتی کــارەکە ( کــری نــیە بــی مانــدوبوون و زەحـمەت ) ، لە میوانخـانەکە مـاینەوە نـاتوانین هـیچ شتیك بکەین ، ناتوانین بچینە دەرەوە جگە لە خواردن و نوســتن زیــاتر ، لە هەفـتەی رابــردووەوە دەســتمان کــردۆتەوە بەکــارکردن لە ئیوارانــدا ، کاتیــك بە چەنــد پاسـیك دەمانبەن و دوبارە دەمانهیننەوە بۆ ئیرە ، ئیمە

دەستبەسەرین و ناتوانین پڕۆین و رزگارمان بیت ( بابا بۆمبۆس ) لای دەرگاکەوە دەنویت ، ڤینیسا قەرزارە بەپڕی ( 140 ) پاوەنی قوبرسی چونکە سەرەتا کە هاتۆتە ئیرە زیڕ و خشلیکی زۆری کڕیوە بەو پارەیە ، گریبەستیکیشی ئیمزا کردووە بەرەو ( هۆڵەندا ) و لە چاوەڕوانی فیزاکەیدایە ، ئەم کچە کاتی خۆی لە وڵاتی خۆیان ژنی فلیپینیەك بووە و لەبەرئەوەی منداڵی نەبووە تەڵاقیداوە . ڤینیسا بە زمانە ئینگلیزیە نلتەواوەکەی وتی وتی : وایدەزانی ( نەزۆکم ) دواتر بەدەم مۆسیقا بەرزەکەی لەو چیشتخانەیە لیدەدرا وردەوردە جلوبەرگەکەی دانا و من جیمهیشت ، بۆ رۆژی دواتر کاتیك چومەوە بیبینم لەو جیگە قیزەونە بینیم بابا بۆمبۆس لەبەردەم ژوورەکەیدا نوستووە لە دەرگاکەمدا ژنەکەی هاتە دەرەوە پیی وتم : کە ئیستا چیشتخانەی ( ڤینۆس ) داخراوە چونکە کچەکانی لی نەماوە و پیویستە قسە لەگەڵ ڕی نویدا بکەم کە ( ئایانۆ ) یە یناکیس دەستی گرتووە بەسەر بازاڕی ( لیماسۆل ) لە ریگەی کۆمپانیایەکی هونەری بەناوی ( G.R.Artistic Promotion ) ژنەکەی لە ( ئەڵمانیا ) بەندە لە ساڵی ( 1990 ) وە دوای ئەوەی لەشاری ( ئیسن ) دەستگیرکراوە و تاوانبارکرا بە ( بازرگانیکردن بە مرۆڤەوە ) لە ئاداری 1991 دا بەندکرا بۆ ماوەی ( 7 ) ساڵ زیندانی . ئەو کچانەی ئەوکات سکاڵایان کردبوو دەڵین : ئیمە لای بابا بۆمبۆس زۆرمان لیدەکرا لە چیشتخانەی ڤینۆس کاربکەین و شەوانەش لە میوانخانەیەکی بچوك

بەناوی ( لاڤین ) دەمـاینەوە کە بابـا بۆمبـۆس خـودی خـــۆی لە نهـــۆمی ســـەرەوە لەبەردەم ئەو ژوورەدا دەنوسـت کە کچەکانی لیبوون و تایبەت بـوو بە کـاری سیکسـی . گەر بهاتایەو کچیـك یەکیـك لەو پیـاوانەی رەت بکردایەتەوە کە داوای دەکرد سزا دەدرا بەبڕینـی بەشیك لە موچەکەی یاخود ریگە نەدان بە کارکردن / هەڵپەســاردن کە ئەمەش دەبــووە هــۆی ئەوەی ئەو کـچە هـیچ پـارەیەکی دەسـت نەکەویـت ، هەروەهـا چەنــد کچیکــی تــریش ســـکاڵایان کردبــوو کە بە چ شـــــیوەیەك دەســـــتدریژیان کراوەتەســـــەر لەلایەن میوانەکانی ئەو یانەیەوە کە لییان داون و پاشـان بـی جلـــــوبەرگ لە ریـــــگە فڕێیـــــان داون ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشـدا ناچارن بگەڕینەوە سـەر کارەکانیان لای ئایانۆ چـــــونکە زۆر لە پۆلیســـــی قوبرســـــی دەترســـــان لەبەرئەوەی هاوکاربوون لەگەڵیدا .

گەر بهاتایەو کچیك سکاڵای بکردایە لەسـەر ئەوەی لە دەموچاوی دراوە ئەوا لەکریـی یەك مـانگی بـی بەش دەکـرا وەك سـزایەك و لەکۆتـایی مانگیشـدا کچەکـان دەگـوازرانەوە بـۆ ( ئەڵمانیـا ) کە زۆرجـار ئایـانۆ لەگەڵ ڕەکەی ئەڵمانیا بەناوی ( کمبابر ) هاوکاری دەکـرد لە ( ئیسـن ) کە فەرمانبەر بوو لە پلەی یەکەمدا ئەوەبوو دواتر دەستگیر دەکریت پاش تاوانبارکردنی لە سـاڵی 1992 بە ( 5 ) ساڵ زیندانی ئەم دوو پیاوە بە یەکەوە ( 500 ) ســەماکەری فۆلکلۆریـان هینـابوو بەو پیـیەی هەر یەکیکیـان لە رۆژیکـدا بـڕی ( 80 ) مـارك لە کـچە ئەڵمانیەکان کەمتر وەرگرن کە هەمـان کاریـان هەیە ،

بەپیی ئەو پسولانەی ئایانۆ پیی دابوون لەو هەشتا مارکە گوایە ( 40 ) مارکی بۆ خۆیانە ، بەڵام تەنها یەکی ( 20 ) مارکی پیدەدان و پسولەی ( 40 ) مارکی پی ئیمزا دەکردن بەزۆر ، ئایانۆ خۆشی مانگانە لەهەر کچیك ( 500 ) مارکی دەستدەکەویت ، پۆلیس بۆ دەستگیرکردنی ئەو دووانە تەلەفۆنەکانیانی خستبووە ژیر چاودیرییەوە و لە چۆنیەتی باسکردنی کچەکان ئاگاداربوون کە چۆن ئەمیان ئاوا شارازایە لە ژوورە سیکسیەکاندا و کردەی سیکسی ئەوی تریان چۆن باشە ئەمی تریان چۆن سەما دەکات و خۆ روتکردنەوەی چۆنە .. هتد . داواکاری گشتی لە دادگا وتی : بەڕاستی ئەمە بازاڕی کڕین و فرۆشی ئاژەڵە کە پۆلیس تەنها کەسیکی لە لوتکەی چیایەکی بەفرینی لیرە دەستگیرکردووە بەڵام تاوانبارانی گەورەی تر لە گەرمای قوبرسدا خۆیان حەشارداوە . پۆلیسی ئەڵمانیا لەگەڵ پۆلیسی قوبرسی هاوکاری ناکات چونکە راست نین و دەستیان تیکەڵە ، کاتیك ( کامبر ) کچەکانی بە دەست دەگەیشت و لە یانەیەکدا دایدەنان گویی نەدەدا کە لەژیر پەستان و زۆرلیکردندان ، چییان لی داوا دەکرا دەبوایە بیانکردایە ، چونکە گەر وا نەبوایە ( موشتەری یان کڕیار ) وەك کاڵایەك دەیگیڕایەوە و پیشەکیەکە یان بڕە پارەکەی خۆی وەردەگرتەوە . ( ئایانۆ و ئارنستۆ باسیل ) بەو کچانەیان دەوت کە لە قوبرسەوە دەیانناردن : خۆ روتکردنەوە و کردەی سیکسی لە ئەڵمانیا قەدەغەیە

ئیوە تەنها سەماکردنتان لەسەرە ، پیشیان دەوتن کە بەم کارەیان پارەو پولیکی زۆریان دەستدەکەویت ، ناوی باسیڵ بۆ یەمجار لە کیشەیەکدا لە ئەڵمانیا ئاشکرابوو کە ئەنجامەکەی بووە هۆی ئەوەی هاتنە ناو ئەو وڵاتەی لی قەدەغە بکریت ، بەم شیوەیە ( برتولد ) ناویك كارەكانی لە یانەی ( باریزیان ) بۆ بەڕیوەدەبرد لە شاری ( ئوزنابروك ) ئەم كابرایە كچانی بۆ یانەی دیكەش پەیدادەكرد ، پاشان پۆلیسی ئەڵمانی بەڵگەی تەواوی دەستكەوت كە پارەی قوبرس رەوانەكراوە بۆ ( باسیل ) لە كاتیكدا ناوی لە پسولە و بەڵگەنامەكاندا دەرناكەویت بەڵكو بەناویكی دەستكردەوە بۆی رەوانە كراوە ناوەكەش بریتی بوو لە ( دیمتری میشیل ) بەرپرسی كارەكە لە ( لیماسۆل ) .

هەروەها پۆلیس چەند بەڵگەنامەیەكی تری دەستكەوتبوو كە بریتی بوون لە گرێبەستی هینانی ( 3 ) گروپ لە شیوەی تیم لە كچان كە پیویستە كچەكان ئیمزا بكەن كە بە ویست و خواستی خۆیان هاتوون بۆ ئەوروپا بەكریی ( 500 ) دۆلار مانگانە لە كاتیكدا گریبەستی دووەم لەگەڵ یانەی شەوانەیەكاندا بەبڕی ( 80 ) مارك لە رۆژیكدا ئیمزا دەكەن كە زۆرجار لەوە كەمتریش وەردەگرن لە گریبەستی سیهەمدا یانەكان تەنها ( 500 ) دۆلار دەداتە كچەكان و باقی ئەو پارانەی دەمینیتەوە رەوانەی قوبرس دەكریت وەك ریككەوتنیكی یەكلایەنە كە بەم پییەش ئەو بازرگانانە بە ملیۆنان فرەنكیان

دەســـتدەکەویت . ( تیمــی ئیکســـپریس) ی ســـی یەکیکە لەو سـی تیمە کە پیکهاتووە لە چـوار کچـی ( مــانیلا ) یــی وەك ســەماکەری فۆلکلــۆر و نمایشـــی جەســـتە کە پیشـــتر لای باســـیل لە نیکۆســـیا کاریـان کردووە لە یانەی ( مکسیم ) کە زۆریان لیکراوە سـەما بکەن و خۆشیان نمایش بکەن تەنها یەکیکیان نەبیـت توانیویەتی بیسەلمینیت ( کچە ) .
لەپاشان باسیل رەوانەی کردوون بۆ ئەڵمانیا کە لەوی ئیجگار کارەکان جیاوازن ، چونکە لەوی هەر شـتیکیان لی داوا بکریت دەبیت بیکەن گەرنا ڕەکەی ئەوی هیچ کـری و پارەیەکیـان نـاداتی تەنـانەت بـۆ خـواردنیش و ناچار ملکەچ دەکەن بۆ هەر کاریك باسیل ئەڵیـت : لە کۆمپانیایەکـدا تەنهـا ( 300 ) هونەرمەنـد ســاڵانە بە گریبەست هەیە ، ئەمەش بـی بـازاڕییە لە ئەنجـامی داخســـتنی بازاڕەکـانی رۆژهەڵاتە چـونکە تـا ئیســتا تەنها ( لوبنان ) یانەی تیدایە لە کاتیکدا لە ( ســوریا ) چەنــد یــانەیەك هەیە و لە ( ئــوردون ) یــش پشـــت دەبەســتریت بە ئورکســترا عەرەبیەکـان ، هۆکـاریکی تـریش بـۆ بـی بـازاڕی باسـیل ئەڵیـت : کـار نەکـردنە لەگەڵ دەوڵەتە رۆژئاواییەکان ، هەوڵمدا کاریان لەگەڵ بـــکەم بەڵام پـــارەی تەواوم نـــادەنی هاوکـــات کچەکانیشـــم بـــۆ نـــانیرنەوە و گـــرنگیش دەدەن بە جوتبوونی سیکسی کە لای من قیـزەونە ( باسـیل ) درۆی دەکرد چونکە شۆفیری ئوتـومبیلەکەیی و سـی کچــی فلیپینــی لە باڵیۆزخـانەی ئەڵمانیـا چـاوەڕوانی فیزاکانیان دەکرد .

بەهەرحـاڵ بازرگـانی باسـیل لەگەڵ ئەوروپـادا تـاکو ئەمرۆ بەشـیوەیەکی زۆرباش بەردەوامە .
ئەو رۆژەش کە مـن دەچـووم بـۆ چـاوپیکەوتن لەگەڵ باسـیل رۆژنامەکان کیشـەیەکیان بڵاوکردبوەوە لە دژی یانەکـانی نمایشـی جەسـتە و سـیکس کـردن لە دورگەکانی ( سـەقلیە ) بەتایبەت لەدژی ئەو یانەیەی کە هەر کچیك گویرایەڵ نەبوایە لە پلیکانەکانەوە فڕی دەدرایە خوارەوە .
بەپیـی وتەکـانی باسـیل خـۆ روتکـردنەوەی تەواو لەیانەکانی قـوبرس قەدەغەیە و ئەو کچـانەی سـەما دەکەن ( مەمـك و پـیش و دوایـان ) بە قەیتـانیکی ئەسـتور و فـراوان دادەپۆشـن ، باسـیل کە ژیـانی لە فـرۆکە و هـاتوچۆدا بەسـەردەبات ئەڵیـت : لە ژیانیـدا نەچۆتە ( مانیلا ) و لەوی چەند کەسیك لەجیاتی ئەم کارەکانی بۆ بەڕیوە دەبەن بۆ هینان و بردنـی کچـان و لە هەر گریبەسـتیك ( 1000 ) دۆلار وەردەگریـت ، باسیل لە سـەردەمی بهادوریانەوە کاری کۆمپانیاکانی گرتـۆتە دەسـت لەبـارەی میـژووی پرشـنگداری کۆمپانیاکـانەوە ئەڵیـت : کـاتی خـۆی ئـیمە لەگەڵ هونەرمەنـدان و ڕانـی پـایەدار و بەرزی نمـونەی ( ئەدیـس بیـاف و ئیـف مۆنتـان و شـارل ئەزنـافور ) کە جیهانی یانە بوون کارمان دەکرد بەڵام ئیستا ئەم کارە بـۆتە کەس بەکەسـی ، ئەمە ئەو شـانازیەیە کە باسیلی دریژە پیـدەری تـۆڕی ملیـاردیرانە کە بەهـۆی سـەدان لە کچـانەوە ئەنجـامی دەدات ، مـن لە میوانخـانەیەکی بچـووك کە نـرخەکەی کەمتـرینە

دابەزیبووم کە بە بەردەوامی تیمیـك لە سـەماکەرانی فلیپینـی لیـیە لە ژووری بچـوك بچوکـدا دەنوسـتن ، کچیکم بینی لەسەر ئەو جلەی لەبەریدا بوو نوسرابوو ( جەستە لەپیناو خۆشەویستیدا دروستکراوە ) .
( ئـۆتە ) مامۆسـتایەکی ئەڵمـانی نەژادە لە قـوبرس دادەنیشیت ئەڵیت : لە قوبرس جەنگیکی سیکسـی خراپ هەیە پاشان چیرۆکی خۆی بـۆ گیـڕامەوە کە لە ساڵی 1981 خۆیی و کچە تەمەن ( 21 ) ساڵانەکەی لە خیوەتگەیەکدا ژیـاون لە بـاکوری قـوبرس کاتیـك لە یەکیـــك لە شــــەوەکاندا ســــەربازیکی قوبرســـــی هەڵــدەکوتیتە ســـەر خیوەتگەکەیــان و لەبەرچــاوی کچەکە دەستدریژی سیکسـی دەکاتە سەر دایکـی و دواجار لە قیندا هەر لەویدا بە هەردوکیان سـەربازەکە دەگرن و هەر لەویدا بە گوریسیك دەیخنکینن ، پاشان تاوانبار دەکرین بە چوار ساڵ زیندانی ، بەڵام پاش ( 5 ) مانــگ و لەژیــر پەســتانیکی زۆری جیهــانی ئــازاد دەکرین ، ئۆتە ئەمە یەکەمین سەردانی بوو بۆ وڵاتـی خۆی ، کاتیك هـاتینە دەرەوە ئەو کچـانەی بەدی کـرد کە فلیپینی بوون بەرەو یانەکان بە پـۆل وەك پەپـولەی رەنگاورەنگ دەڕۆن هەناسـەیەکی هەڵکیشـاو وتـی : ئیمەی ئافرەت دڵفڕینین بەڵام لەپینـاو هیچـدا خۆمـان دەکوژین و دەسوتیین .

# بەشـی دووەم

## چیرۆکی دروسـتبوونی تۆڕی ملیاردیر

لە یـانەی ( ئیمپەسـادۆر ) لە روتـردام مـن و ( دیڤیـد بران ) هاوڕیم دانیشـتبوین و سـەیری ئەو کابرایەمـان دەکـرد کە سـەرقاڵی یـاری پەهلەوانـیە بە هاوکـاری سەمای کچەکان ، دیڤید لە کابرای بەریتانی بەنـاوی ( جون دیڤـیس ) ی پرسـی ئـافرەت نرخـی چەنـدە ؟ جون وتی : لەزۆر حاڵەتدا بە کڕینی شامپانیا خۆت لە کچەکە نزیـك دەکەیـتەوە ، دوو جـۆر شـامپانیا هەیە ( سـوك و قـورس ) بەڵام بەقسـەی مـن دەکەیـت قورسـەکە باشترە بۆ ئەوەی تەواو ئەو شـەوە شـادبیت ، پیویستیشـە لە روی سیکسیشـەوە لە نرخدا لەگەڵ ریککەویت ( یەك کـاتژمیر 400 فلـۆران ) ی هۆڵەنـدی لەوانەیە بەلاتەوە زۆربیـت یـان گـران بیـت بەڵام ئیـرە یانەیەکی تایبەتە یانەی پیاوانی خاوەن کاری گەورەیە کچانیش لیـرە تەنهـا لەگەڵ یەك کەس ریکـدەکەون و هەمـوو ( 100 % ) لەرووی تەندروسـتیەوە بـی کەموکـوڕین ، هینـدەی نەمـابوو داوای کچـانی ( هەنگاری ، فلیپینـی ، دانیمـارکی ) بکەیـن بەڵام ئەو قسـەی پـی بـڕین و ئامۆژگـاری کـردین کە کچـانی دانیمارکی گەرمـن و باشـترینن بە پـلەی یەکەم دیـن لیـرە ، پـاش کەمیـك گەورەکانیـان کە دووان بـوون بە ناوەکـانی ( میکـی گەورە و فیـری ) بە شـان و

شـــەوکەتیکی بەخـــۆوە خۆیـــان کـــرد بە ژووردا و کچوکـانیش کە هەمـوو لە نزیـك میـزی خـواردنەوەکە لای باڕەکەوە بە تەنورەیەکی کورت و لباسـی رەش و پـیڵاوی پـاژنە بەرزەوە دانیشـتبوون زەردەخەنەیەکـی دەسـتکردیانکرد . هەرکەسـیك بیـتە ژوورەوە بـۆ نـاو یانەکە پسـوڵەیەك بەبڕی ( 50 ملیـۆن ) فلـۆران پیـنج پسـوڵە دەیڕیـت بـۆ خـواردنەوە ، بەڵام جـۆنی بـی رەوشـت بە یەکجـار دوو پسـوڵەی لەئـیمە سـەند بـۆ ئەوەی کـات بەسـەر نەبەیـن ، ئەم یـانەیە لە سـەر شـیوەی پیتـی ئینگلیـزی ( L ) ی لاتینـی بەدەوری شانۆیەکدا دروسـتکرابوو کە کچەکـان وەك شـوینیکی بەرزتـر لە نـاو هـۆڵەکە نمایشـی لەسـەر ئەکەن و نـاوەوەی یـانەکە سـەرتایا بە پەڕ و رەنگـی سـوور تیرکرابوو .

وردەوردە میزەکـانی دەوروبەرمـان بە میـوان پڕبـوەوە میوانەکان هەمـوو خەڵکـی گەورە و گرنـگ بـوون وەك ئەوانەی لە فیلمەکانـدا دەسـتی بـوکی دەگـرن و دەیـــبەنە لای زاوا ، لەســـــەر دەرگـــــایەك لای دەستشـۆرەکانەوە نوسـرابوو ( میوانخـانەی ئینسـفۆرد ) کە لە نهـۆمی دووەمـی یـانەکەیە و ژوورەکـانی تـایبەتە بە کـردەی سیکسـی و لەبەردەم دەرگـاکە کـابرایەك راوەسـتاوە و هـاوار دەکـات ( هەر ئیسـتا کـــردەی سیکســـی دەســـت پیـــدەکات ) ، ئوتومبیلەکـانی هەردوو سـەرۆکی یـانەکە لەجـۆری ( جـاکوار ) بـوو لەسـەر شۆسـتەی یـانەکە راگیرابـوون لەگەڵ ئەوەشـدا دەوریەکانی پۆلیس دەیانبینی و هیچ

گوییــان پــی نەدەدا لەکاتیکــدا کە قەدەغە بــوو بەو شیوەیە ئوتومبیل رابگیریت .
لەم شەوە ساردەی زستاندا من و ( دیڤید بران ) ی هـــاوڕیم کە لە کەنـــاڵی ( BBC.Tv ) کاردەکـــات ســـەرقاڵی ئامـــادەکردنی فیلمیـــك بـــوو لەســـەر ( بازرگـــانیکردنی ئـــافرەت ) خۆمـــان کردبـــوو بە دوو میوانی سەرخۆش .
یانەی ( ملیاردیر ) لە دووری ( 100 م ) لەنوسینگەی ( ســـتاج ) ی هـــونەرییەوە دوربـــوو کە بە ئاســـانی دەمانتوانی هەردوکیان لیرەوە بەدی بکەین لە کاتیکدا کامیرای ڤیدیۆ ئامادەکرابوو لە ( ئیمپەسادۆر ) و تەنها نمایشـــکردن دەســـتی پیکردبـــوو ، بەڵام لە یـــانەی ملیاردیر سیکسی تەواو بوو.
فیلمیك بەناوی ( پلای بۆی ) لەسەر شاشەی گەورە گەورە پیشـــان دەدراو تیایـــدا چەنـــدین ئـــافرەت بەبـــی جلـوبەرگ دەبینـران ، لەو کـاتەدا ( جـۆن گافیل ) ی ڕ پاڵی بە کچەکانەوە دەنا بۆلای میوانەکان و ئەیوت : گەر ئیوە بەباشـی هەڵسـوکەوتیان لەگەڵ بکەن ئەوان هەموو شتیك دەکەن.
هەرچۆنیـــك بیـــت پیـــاو دەتوانیـــت لەگەڵ ئـــافرەتیکی فلیپینی جووت ببیت تەنها بە دوو بتڵ شامپانیا ، لە یـانەکەدا کچیکـی هەنگـاری لـی بـوو دەموچـاوی گریانـاوی دیـاربوو لە سـوچیکدا دانیشـتبوو لە زومبـی دەچوو هەنگاریەکی تریش سەرقاڵی خـۆ روتکـردنەوە و نمایشکردنی لەشی بوو بەڵام زۆر جیگـای سـەرنج بوو چونکە زۆر منداڵ بوو مەمکی نەبوو ( دیڤد )

ی هاوڕیم هیندەی پی ناخۆش بوو کاریگەری کردبـوە سەری و وتی : سەیری کچە دوانزە ساڵانەکەی خۆم دەکەم ، یانەکـــانی ( رۆتـــردام ) بە یەردەوامـــی ســـەرقاڵی ســـەما و نمایشـــی جەســـتە بـــوون و هەمووش سەر بە تـۆڕی ( ملیـاردیر ) بـوون و هەردوو ســـەرۆکی یـانەکەش دوو ڕی لیهـاتوو بـوون ( مـارك فلیســیە ) ناســراو بە مـارکی گەورە ســاڵی 1973 بە ( 18 ) مانـــگ زینـــدانی کـــرا بە تـــاوانی بەچەکەوە هەڵکوتـــانە ســـەر گەنجینەیەکـــی پـــارە و لە دوای ئازادکردنی هاتۆتە دونیای ( یانەکان ) ەوە و ئەو یانانە هەموو جۆرە نمایشیکی گۆرانی هەمەرەنگـی وەلاوە نـابوو و بوبـوونە شـوینی نمایشـی کچـان و سـیکس کردن ، یانەی ( Le Paul au Getty ) دەرگاکانی لە ( بروکســل ) داخســت کە دوا یـانەبوو لەســـەر شـــیوەی کـــۆنی خـــۆی مـــابوەوە لە هەشتاکانەوە .

( مارك فلسیە ) لەگەڵ ئافرەتیکی هـاوڕیی بەنـاوی ( شـــانتال ) چەنـــد یـــانەیەکی بچـــوکی کـــردەوە لە حەفتاکانــدا تیایانــدا ســـەما و نمایشـــی تیـدابوو لەو ســـەردەمەدا بـــۆ یەکەمجـــار زنجیرەیەکیـــان پیکهینـــا بەنـــاوی ( پـــلای بـــۆی ) و پاشـــان ( پـــالم بـــیش ) ، لەســـــــاڵی 1978 لەلایەن پۆلیســـــــەوە روبەروی لیکۆڵینەوە دەبیت بەهۆی ئەوەی لەگەڵ دوو هـاوڕیی لە یەکیك لە میوانەکانی یانەیان دابوو و بی جلوبەرگ لە کەنار دەریا جییان هیشتبوو لەســەر ئەوەی کریـی نەدابوو کە کـابرایەکی رۆژنـامەنووس بـوو بـوو پاشـان

هــاتبوە دەرەوە و لە بــاخچەیەکی بینــایەکی چۆڵــدا لەهۆش خـۆی چوبـوو لەپاشـان و لە دوای دوو مانـگ دەرگاوانەکەی ( پـالم بـیش ) زانیـاری دابـووە پـۆلیس ســـەبارەت بە رووداوی رۆژنـــامە نووســـەکە بەڵام لەلایەن پیاوەکانی فلسـیەوە لیـدانیکی زۆر دەخـوات و نزیکـــی مردنـــی دەکەنەوە ، هەرچەنـــد پـــۆلیس نەیانتوانی بیسـەلمینن پیاوانی فلسیە وایان لیکردووە .

لەو سـەردەمەدا ( مـارك فلسـیە ) لە کۆشـکیکدا لە ( لاتم سـان مورتان ) دەژیـاو مەمـلەکەتەکەی لە یـانە و شـوینی سـەماکردن بریتـی بـوو لە تەواوی ( فلانـدر و بروکسـل ) .

ئەو سـاڵانە بە سـەرەتایەك بـۆ فلسـیە دادەنریـت لە هینانی کچان و ئافرەتانی بیانی بۆ ئەوروپای رۆژئـاوا ، فلسـیە بە دەیان لە ئافرەتانی داوا دەکـرد تـا ببـنە ڕی کارەکـــانی لە هەریەك لە ( بەلجیکـــا و مۆنـــاکۆ و سویســـــرا ) . بەڵام لە ســـــاڵی 1981 تووشــــی گیروگرفـت دیـت لەلایەن پۆلیسـەوە لەسـەر کچیکـی بەلجیکی کە لە یانەیەکی نویدا لە ( دینز ) خسـتبویە کار ، کاتیـك کە بەڵینـی پیـدابوو کە هاوکـاری بکـات و پارەو پولیکی باشـی دەستدەکەویت ، بەڵام نەك هەر هاوکاری نەدەکرا بەڵکو زۆری لیدەکرا کاری سـیکسـی و نمایشـــی جەســـتەی بکـــات و چ پارەیەکیشـــی دەســـتدەکەوت لەلایەن پیاوەکــانی فلســـیەوە لیـــی دەسـەندرا .

فلسـیە سـوربوو لەسـەر ئەوەی کچـی زیـاتر بخـاتە سەرکار بـۆ بەرژەوەنـدی خـۆی بەڕیـگەی نایاسـایی و ئەم کیشـەیە زیاتر لە ساڵیکی خایاند ، فلسـیە جـگە لە هاوڕییەکی چەکداری بەناوی ( کلود ) لە ( روتردام ) کە زۆر دڵسـۆزی بـوو و هاوکـاری کەسـی تـری نەدەکرد .
لە هەمـان کاتـدا ( کلـود ) بە یەك سـاڵ زینـدانی لە سـاڵی 1983 زینـدانی کـرا بە تـاوانی کـردنەوەی خانویەك بۆ کاری سیکسی پاشان ئەم دوانە هەڵدین و رادەکەن ، پـاش داخسـتنی ( پـالم بـیش ) و راگەیاندنی کەوتنی ئەم زنجیـرەیە لە رووی دارایـیەوە بـۆیە نەیتـوانی کـاری تـر بگـریتە دەسـت لە بەلجیکـا بەنـاوی خـۆیەوە چـونکە لە بـاکوری فەرەنسـادا یـانە رەواجی نەمابوو کەمـی مردبـوو بەهـۆی لیـك دانیـان لەگەڵ مافیادا ، دواتر فلسیە سەرلەنوی لە سویسـرا لەگەڵ کچیکـی هـاوڕیی بەنـاوی ( کلودیـا ) سـەری هەڵدا دوای ئەوەی کچیکی لیـی بـوو سـاڵی 1981 ( کلودیا ) سەماکەری یەکیـك لە یـانە تایبەتیەکـان بـوو دواتر یانەکانی ( پالم بیش ) ی ژمـارە ( 1 ، 2 ، 3 ) ی بەڕیوە دەبرد .
لە ( جنیف ) یش چەنـد ئـافرەتیکی سـۆزانی دۆزیەوە کە راسـتەوخۆ رایکیشـان بەلای خۆیـدا بـۆ کـارکردن ، لەپاشـان لە ( سویسـرا ) روبەروی گیروگرفـت بـۆوە لەلایەن پۆلیسـی سویسـریەوە و سـەرجەم ئافرەتەکانی لەو وڵاتە دەرکران . ئەنجا چووە ( کان ) و لەوی ژیـانی بەسـەربرد لە دوای ئەوەی ( کلودیـا )

چیتر نەیتوانی پارەی بۆ پەیدا بکات ( فلسیە ) زۆری لیدەدات و رەوانەی شیتخانەی دەکات ، ( کلودیا ) ش لای پۆلیس سکالای لی دەکات و پاش ئەوەی ئاشکرا دەبیت لەگەڵ چەند ئافرەتیکی سۆزانیدا دەستی تیکەڵ کردووە بە ( 18 ) ساڵ زیندانی دەکریت بە تاوانی پەیداکردنی پارە بەشیوەی ناشیاو لە ساڵی 1984 دەدریتە بەندیخانەی ( هیرکسبلاس ) لە بەلجیکا . پاش ئەوەی بۆ یەکەمجار ئازاد دەکریت بۆ بەسەربردنی شەوی سەری ساڵ هەڵدیت و خۆی دەگەیەنیتە ( روتردام ) تا قۆناغیکی نویی پرشنگدار دەست پی بکات لە بواری کارکردندا ، سەرەتای دەست پیکردنەوەی ژیانی باش نەبوو ، لەگەڵ کچەکانی ڕیکی هونەری بروکسلی هاوڕیی بەناوی ( رونی دوریان ) کە گەڕۆك بوو لەگەڵ کچەکان ئەم بەڕیوبەرە پیستی ( مار و ریوی ) و تۆزیك کە بەکار دەهینرا دژی تووش بوون بە ( ئییدز ) ی دەفرۆشت بە نرخی ( 75 ) فلۆران ، ڕی یانەکان دەیانوت بەردەوام پارەی دەست دەکەویت .

ساڵی 1986 فلسیە پەیوەندی دەکات بە ( روبیرڤان ئەنگلاند ) کە پسپۆڕیکی سیکسی بوو ، هەردوو یەکتریان لە هەشتاکانەوە دەناسی وا ئەمڕۆ لە ( لەندەن ) و لە رابردودا ( ڤان ) بە دزینی ( 29 ) کچی هیلی ئاسنین تاوانبارکرابوو ، دواتر لە سەرەتای هەشتاکاندا چەند یانەیەکی شەوانەی دامەزراند و خیرا بەهۆی ڕی یانەکەوە کە ناوی ( زوبڵ ) ی هۆڵەندی بوو ڤان ئەنگلاند بەگویرایەڵیەوە

ئامۆژگاریەکـانی گـرتە گـوێ تـاکو ببیـتە باشــترین ڕی هونەری سـەما دواتر دەزگایەك دەکاتەوە ئەویش پاش ساڵ و نیویك لە کردنەوەی دادەخریت .
لە سالّی ( 1984 ) دا ( ڤان ) بە دزینـی چـوار ملیـۆن فرانك تاوانبار دەکریت کە لە شیوەی چەکـدا لە خـانە نشــینیکی ســەربازی دزیبــوو ، دواتــر و دوای ســالّیك دەچیت بۆ ( ڕۆتردام ) و لەوی دەستگیر دەکریت دوای ئەوەی دەمــانچەیەکی جــۆری ( کۆڵــت ) ی پــی دەگیریـت ، لە دادگـا وتـی ئەو تەنهـا وەك ئـارەزویەك حەزی بە چەکە ، بەڵام دوای لیکــۆڵینەوەی پــۆلیس دەرکەوت کە ئەو دەمـــانچەیە یەکــــیکە لەو ( 34 ) دەمانچەیەی لە دادگای ( لیج ) دزرابوو ، پاشان چوارساڵ و یەك مانگ بەند دەکریت لە بەنـدیخانەی ( بریـدو ) پـاش ئـازادکردنی وتـی کە کاتەکـانی زۆر بە خۆشــی بەســەر بـردووە ، لەبەرئەوەی لە بەنـدیخانە تەلەفزیــۆنیکی ڕەنگاورەنــگ و نوســینگەی تــایبەت و گەرماوی هەبووە .
( روبیرڤان ئەنگلاند ) کابرایەکی هیچ بـووە چـونکە لە کاسیتیکی ڤیدیۆیدا ری و ڕەسمی بەحاك سـپاردنی باوکی پیشـان دەدات سـالّی ( 1989 ) کە دەبینریـت لەو کاتەدا سەرقالّی قایلکردنی کچی براکەیەتـی کە تەمەنـی ( 16 ) ســاڵانە تـاکو لە یەکیـك لە یانەکـانی تایبەت بە کـردەی سیکسـی کاربکـات ، لەپڕ دایکـی هەڵـدەداتی و ئەمـیش پیـی دەڕیـت و دەڵیـت : دایە مـن بەدوای ئافرەتیکـدا دەگەڕیـم ئەرکـی دارایـی و

داهاتم بۆ بگریتە دەست و دەتوانیت هەزاران فرانکی دەستکەویت .
لە هەمـــان فیلمـــدا پیـــاوانی ســـەرپەرتیار و هەڵســـوڕینەرانی سیکســـی بەدی دەکـــران بە ئوتومبیلەکانی جۆری ( جاگوار و مرسیدس ) بەشوین تەرمەکەوە بوون جگە لە ( فیلسیە ) کە لە بەلجیکا پۆلیس بەشوینیدا دەگەڕا .
ئەم گروپە بەجلوبەرگ و عەینەکی تاریکەوە لە ( مافیای سەقلیە ) دەچوون و چەندین دەستە گوڵیان بە دەستەوە بوو کە ناوی چەندین یانەی سیکسی پیوەبوو .
لە ئەندامە دیرینەکانی ئەو گروپە ( ڤان ئەنگلاند ) بوو کە زۆر هیچ بوو بەڵام راست و لە روو بوو ، ( فلسیە ) رووی لەو خۆشـــتربوو بەڵام درۆزن و دەســـتپڕبوو لە بواری کارکردنیشدا هەردوو وەك بەرد وابون و ئافرەت لایان تەنها وەك بازرگانی بوو .
ئەم دوانە لە هەشتاکاندا لە رۆتردام زۆر بی پارەبوون ، بەڵام دوای ئەەی بڕیار دەدەن کارەکانیان یەکخەن پارەو سامانیکی زۆریان دەستدەکەویت . واتای بوون و دەوڵەمەنـــدییان لەریـــگەی یەکخســـتنی یـــانە شەوانەییەکانیانەوە و خۆیان وتەنی بەهۆی کچانی هونەرمەنـــدەوە ، و توانیـــان دەســـتبگرن بەســـەر کچانیکی زۆر و دەستیان ببڕن . یەکەم هەنگاویشیان لەم بوارەدا ساڵی ( 1986 ) بوو واتە دوای ساڵیك لە هەڵهاتنی فلسیە ، سەرەتا لە کۆمپانیایەك کاریان کرد بە ناوی ( مایك و کلودیا ) دواتر یانەی ( پلازا ) ی

بەناوبانگیــان کــڕییەوە کە لە ســـەردەمی جەنگــی جیهانی دووەمەوە بنیادنراوە و ناویاننا ( ملیاردیر ) . پاشــان بیناکەیــان دایە دەســت هەردوو بەڵینــدەری سیکسی بەناوبانگ ( زاب هوکی و کوردی کـوس ) ئەم دووانە دواتـریش چەنـدین بینـای تریـان بەکری گرت بۆ هەمان مەبەست بە نرخی خەیـاڵی ، هیندەی نەخایانـد ( ملیـاردیر ) بـووە جیگەیەکـی بەناوبانگ وەك بیری ئاڵتونی لیهات بەهـۆی کچـانەوە هەر لە شـــیوازی کـــارکردنی نمایشـــی جەســـتەو ســـەماکردن و لەشفرۆشـــی و لە ســـاڵی ( 1987 ) یانەی ( ئەمپەسادۆر ) یان بنیادنا و بڕی ( 16 ) ملیۆن فرانکی بەلجیکیان کردە ئەو پرۆژەیەوە ، لەو ساڵانەدا کچـــانیکی زۆریـــان خســـتە کـــارەوە لەریـــگەی بەڵیندەریکیانەوە لە ( هۆڵەندە ) بەناوی ( جـۆن واردل ) کە پەیوەنــدی ئــابوری و دارایــی لەگەڵ ئەوروپــادا پتەوبـوو ئەم ئەو بـوارەی گرتبـوە ئەسـتۆ ، بەڵام داوی مــاوەیەك لەگەڵ ئەم بەڵینــدەرە تیکــدەچن بەهــۆی ئەوەی کە گومـانی ئەوەیـان لـی دەکـرد پـارەوپولیکی زۆری خســتبیتە گیرفـانی تـایبەتی خـۆیەوە ، پاشــان نوســـینگەیەکی هـــونەری بچکۆلانەیـــان بەنـــاوی ( ســـتراس شـــوز ) گـــرت کە لەلایەن کـــابرایەکی بەلجیکـــــــیەوە بەڕیـــــــوەدەبرا و کردیـــــــانە ( Stago Iintrnational Artist Agency ) ئەم کۆمپانیایەیان لەژیـر نـاویکی سـاختەدا لە ( لەنـدەن ) بەناوی ( لیبیدال لیمیتد ) تۆمارکرد .

ئەم کۆمپانیایە بناغەی کۆتایی ئیمپراتۆریەتەکەیان بوو ، کاری سەرەکی ئەم کۆمپانیایە کە ( ستاج ) بوو تایبەت بوو بە ئامادەکردنی کچان بۆ یانەکان و ئەرشیفکردنی بەڵگەنامەکان .
لە ساڵی ( 1988 / دیریك ڤانکن ) ناویکیان بە ڕ دامەزراند کە ڕیکی هونەری بەلجیکی دورخراوەبوو بەچەند هۆیەك یەك لەو هۆکارانە قەرزداربوونی بە ( نیو ) ملیۆن فرانکی بەلجیکی . ئەم ڕەش کچیکی هاوڕیی خۆی بەناوی ( رنیات ) بەپیی ئەو نوسینەی ناسنامەکەی بیت نوسرابوو ( بەرپرسی پەیوەندیە گشتیەکان ) بوبوە جەمسەری سەرەکی بەڕیوەبردن لە تۆڕەکەدا .
لە کۆتایی هەشتاکاندا ئەم دوو بەلجیکیە بوبوونە گەورەترین بازرگانانی تایبەت بە سیکس لە شاری رۆتردام کە ( 25 ) یانەی شەوانە و ( 30 ) خانوی تایبەت بەکردەی سیکسی تیدابوو .
ئەم تۆڕە کارەکانی گەشە پیکرد تاکو لە ساڵی ( 1989 ) دا بەلجیکا و برۆکسل بگریتەوە دواتر و بۆ ساڵەکانی ( 1990 – 1992 ) لەو کاتەشدا سەرقاڵی پرۆژەیەك بوون بۆ دامەزراندنی چەند یانەیەکی تایبەت بە سیکس لە ( ئیسپانیا ) ، لە ساڵی 1991 دا هاتنە ( تورکیا ) بۆ گەران بەدوای یانەدا ئەم بازرگانانە لە کارەکانیاندا زۆر هیمن و وردبوون زۆر ژیرانەش کاریان دەکرد ، وای لیهات گەیشتنە ( هنگاریا ) هەر لەژیر ناوی ڕانی هونەریدا بۆ ئەوەی بزانن دەتوانن لقیان

هەبیـت لە دەوڵەتـانی ئەوروپـای رۆژهەڵاتـی رابـردوو شـیوعیەت .
ئەم دوو ســـەرکردەیە جـــاری وا هەبـــوو ( 3 ) رۆژی بەردەوام و لەسـەر یەك كاریان كـردووە بـی نوسـتن ، تۆڕەكەیان زۆر بە پتەوی شـانە بەند كردبـوو نـزیكەی ( 13 ) ئەندامی جیگیری بەلجیكیان ئامادەكردبوو كە لە بەندیخانە ناسیبویانن بۆ ئەوەی كـاری بەرپرســیاریتی و یانەكانیان بۆ ڕن .
لەو ڕانە وەك ( جـۆن دیڤـس و جۆهـان جافـڵ ) نەك هەر بـڕی ( 500 ) هەزار فلۆرانیـان وەك مـووچە وەردەگــرت ، بەڵكــو بۆیــان هەبـوو چەنــد ئافرەتیــك بەتـایبەتی كاریـان بـۆ بكـات ، ئەم ڕانە وەك ســەگی پاسـەوانی بەدوی گەورەكانیانەوە بوون و خزمەتكـاری دڵســـۆزی پیلاوەكانیـــان بـــوون . ( جـــۆن دیڤـــس ) ی بەریتانی كە لە هەشتاكانەوە لە خزمەتی فلسیەدایە خاوەنی فایلیكی گەورەیە لە تاوان لە ( ئینگلـتەرە ) و ئیســـتا بـــۆتە نـــیمچە بەلجیكـــیەك چـــونكە زمـــانی بەلجیكـیەكەی تەواو رەوانە، بەڵام ( جۆهـان جافـڵ ) مـاوەیەكی دورودریــژ لە یانەكـانی بەلجیكـادا كـاری كــردووە و لە ســاڵی ( 1986 ) دا مــاوەی دوو ســـاڵ چۆتە فلیپین و فیری زمان و نوسینی ( تاجالوجوهی ) فلیپینـــی بوبـــوو . لە ســـاڵی 1988 دا پـــاش ئەوەی پـــۆلیس بەدوایـــدا دەگەڕا لە ( كـــورتریە ) بە تـــاوانی بازرگـــانیكردن بە مـــرۆڤەوە چـــونكە چەنـــد كچیكـــی تایلاندی بە دزییەوە هینابووە ئەو وڵاتە هەڵـدیت بـۆ ( رۆتـردام ) پـۆلیس ئەڵیــت : دەیەویــت ژیـانیكی نـوی

دەست پی بکات ، ئەو بە بەلجیکای دەوت ( دەوڵەتی پۆلیس ) لە دەوروبەری ڕانی دڵسۆزانی لە نمونەی ( دیڤیس و جافڵ ) چەند کەسانیکی تر هەن وەك ماسی ورد کاری نهینگری یانە و دەرگاوان و پاسەوانی و پیاوانی ئامادە بۆ هەر کاریك و پیاوانی تایبەت بە هەڕەشەلیکردن و لیدان و شۆفیر و سیخوڕ و هتد ... هەبوون . جگە لەمانەش پیاوانی تایبەت بە کوشتن هەبوون ، لە پشتی پەردەش پاریزەران و کارگیڕان و پزیشك و پیاوانی پۆلیس و فەرمانبەرانی میری هەبوون کە کاریان چارەسەر و داپۆشینی کیشە و گرفتی کارەکان بوون ؟ هەردوو یانەی ( ئەمپەسادۆر و ماکسیم ) ی فراوان و بەناوبانگ داهاتیان نەبوو بەڵام ( فلسیە ) یەکیك بوو لە خەونەکانی و هەردوکیانی وەك خۆی و لای خۆی هیشتبوەوە تاکو لەپیش چاوی خەڵکیش ون نەبیت ، پیاوانی ئەم تۆڕە هەموو خەڵکانی گومانلیکراوبوون و بە نهینی دەژیان و هاتوچۆیان دەکرد لەبر چەند هۆیەك ، هەندیکیان بازرگانی ( تلیاك ) بوون یان چەندین شتی تری قەدەغە و زۆربەیان لە ( ئیسپانیا ) پەناهەندەبوون و هەڵهاتوی دەستی گەورەکانیان بوون بە دەستبڕین و هیچ ریزیکیان نەبوو هەر کاتیك بی کەڵك بونایە دوای ئەوەی ئەو کارانەی پییان سپیردرابوو ئەنجامیان بدایە وەلاوە دەنران لە کچەکان خراپتر ، هەر کەسیکیش جیا ببوایەتەوەو بە تەنها کاری بکردایە بە سنگە خشی و شکست خواردووی دەهاتەوە چونکە سنوری کارکردنی

دەستنیشـانکراوبوو . بەم شـیوەیە ئەو دوژمـنەی تـا دوینی دوژمن بـوو ئەمڕۆ دەبـوە هـاوڕییەکی دڵسـۆزو زۆر زەحمەتە بەدوادا گەڕانی کەسیك لەو نیوەنـدەدا . چـونکە هەر یەکیکیـان ژمـارە تەلەفـۆنیکی نهینـی و ئوتومبیلیکی کـری و خـانویەکی بەنـاویکی سـاختەوە هەبـوو ، بەردەوامـیش دەجـوڵان و زوو زووش ناونیشانی خۆیان دەگۆڕی ، کاتیکیش گەر تەلەفۆنـت بکـردایە چەنـد ( جفـرە ) یەك هەبـوو و چاوپیکەوتنەکانیـان لە چەنـد جیگەیەکـی دیـاریکراو یـاخود میوانخـانە بچکۆلانەکـانی سـەر ریگاکـان کە تـایبەت بـوون بە حەوانەی کـۆچکەران لەسـەر سـنورەکان ئەنجـام دەدا ، گەر کەسـیکیش داوای چاوپیکەوتنی بکردایە چەندین کاتژمیر رایان دەگرت بـۆ تاقیکردنەوە ، لەم تۆڕەدا ( فیری فاناگر ) رۆڵی ئەفسـەر یان ڕی ئاسایشـی گرتبوە ئەستۆ توانـایەکی پـتەوی هەبـوو لە راکیشـانی کچـان و کچەکـانیش لە چـاوی و سـاردیەکەی ترسـابوون ، لە 1987 دا ئازادکراوە لە بەنـدیخانەیەکی بەلجیکـی دوای ئەوەی زینـدانی کرابـوو بە تـاوانی کوشـتنی کـچە سەماکەریکی ( دومنیکانی ) پاشان هەڵهاتبوو چوبوە رۆتردام و چەندین لە سـەماکەرانی شـڵەژاند ، سـەرەتا وەك سـەگی پاسـەوانی کـاری دەکـرد دواتـر بـووە دەسـتە راسـتی ( فلسـیە و ڤـان ئەنگلانـد ) و سـەری سـیهەم لە تـۆڕەکەدا ( فیـری ) وەك پیـاوکوژ وابـوو سـڵی لە هـیچ شـتیك نەدەکـردەوە هەرچـی

بویستایە دەیکرد لە کوشتن و بڕین و ساختەکاری لەپیناو سەرنج راکیشانی سەرۆکەکانی .
لە هاوڕی پیاوکوژە ئازیزەکانی پیاوکوژی گەورەی بەلجیکی ( پاتریك هامر ) کە لە بەلجیکا مایەوە تا ئەو کاتەی سەرۆك وەزیرانی ئەو وڵاتە بەناوی ( پوڵ ڤاندنبوینات ) بوو رفینرا دواتر هەڵدیت بەرەو ( بەرازیل ) ئەو وڵاتەی بەردەوام ( فیری ) رووی تیدەکات بۆ کات بەسەربردن ، فیری ئەو شارەزاییەی نەبوو لەبواری بازرگانی ئافرەتاندا چونکە لەژیانیدا کاری نەکردبوو . بەردەوام پشتی بە کاری ئافرەتان بەستبوو و پارەی پی پەیداکردبوون ، فیری ئەوەی بۆ باسکردم کە چۆن ئافرەتیکی پارچەپارچە کردووە تا کچەکانی پی بترسینیت ، بەڵام لە راستیدا بەو شیوەیە نەبوو ، چیرۆکەکە ئەوەبوو کە لە تەمموزی 1984 دا پۆلیس لاشەی ئافرەتیك لە دەریادا دەدۆزیتەوە دوای ئەوەی ( 14 ) رۆژ لە ئاوەکەدا مابووەوە پۆلیس بە زەحمەت توانی بزانیت کە ئەو لاشەیە لاشەی سەماکەریکی دومنیکانیە ، پاشان فیری دەستگیردەکریت کە هیندە نەبوو لە لەگەڵ ژنە فەرەنسیەکەی لە پشوویەك لە فەرەنسا گەڕابوەوە ( فیری ) دانی بەوەدا نا کە راستە ئەو ئافرەتەی خنکاندووە دوای دەنگەدەنگیکی زۆر لە نیوانیاندا بە وتەی ئەو گوایە ئەو کچە بڕی ( 33 ) هەزار فلۆرانی لی دزیوە بۆ گیرفانی تایبەتی خۆی و لەدوای خنکاندنی و دوای ئەوەی ( 10 / کغم ) بەردی لەگەڵدا کردۆتە کیسە خەویکەوە لەسەر پردیکی

بەرزەوە فڕێــی داوەتە نــاو دەریــاوە . پــاش ســـاڵێك دادگایی فیری بە تاوانی لیدان و بیندارکردن و کوشتن تاوانبار دەکریت و پاریزەری کوژراوەکەش داوای ( 75 ) هەزار فرانکی فەرەنســی دەکـات وەك قەرەبـویەك بـۆ بنەمـاڵەی کـچە کـوژراوەکە و فیـریش بە ( 6 ) سـاڵ زیندانی دەکریت و دواتر هەمان ئەو پاریزەرە و بە ناوی سـاختەی ( ڤیکتـورویم ) دەبیـتە پـاریزەری یەکەمـی تۆڕەکە . ئەم کچە کوژراوە وەك کچـانیتری دومنیکـانی لە ریگەی ڕی هونەری ( جوزیە ناڤـارۆ ) لە سـەرەتای هەشتاکاندا هـاتبووە ئەو وڵاتە ، کـچە دومنیکانیەکـان زورترین کچانی یانە شەوانەییکانی ئەوروپا پیکـدینن ، لەبەرئەوەی هەژاری بـــاڵی کیشـــاوە بەســـەر وڵاتەکەیانـدا و هەل و مەرج لەبـارە بـۆ بازرگـانیکردنی ئافرەتانیان .

# بەشی سیهەم

## ئەوروپای رۆژئاواو کاری بەدرەوشتی

لە ئیستادا ( ئیتالیا ) بە یەکیـك لەو وڵاتـانە دادەنریـت کە کـاری بەدرەوشــتی سیکســی تیـــدا ئەنجـــام دەدریـــت و ئافرەتـــانیکی زۆری بەدرەوشـــتی ئەفریقـــایی و بەرازیلـــی شــەقامەکانی ( رۆمـا و تیـران وپۆلۆن و فلۆرانس و بارم ) یان تەنیوە .

بەپیــی وتەی ( ســـەمیرە زراکــت ) کە یەکــیکە لە کۆچکەرانی ( سیلوســی ) ئەوا تەنهـا لە ( نایجیریـا )

وە زیــاتر لە ( 9000 ) هەزار ئــافرەتی بەدرەوشـــتی رەش پیست هـاتوون ، هەر لەبەر ئەوەشـە لە ئیتالیـا بەزۆری بـاس لە ( Lagos Express ) دەکریـت کە بـی وەسـتان لە هەشـتاکاندا لەو کـاتەی ئـابوری ناپجیریا داروخاوە هاتوون ، ( 90 % ) ی ئەو ڤیزایانەی باڵیۆزخـانەی ئیتالیـا دەیـداتە نایجیریـا هەمـووی بـۆ کچانی تەمەن ( 18 – 30 ) سـاڵن ، بەم شـــیوەیە گروتینیکـــی نـــوی درا بە بە ئافرەتـــانی بەدرەوشـــتی رەش پیســـت لەو وڵاتەدا لە کاتیکـــدا ئافرەتـــانی ســـپی پیســـتی ئەو وڵاتە ســـەرقاڵی راگەیانــدن و پروپاگەنــدە بــوون ، پیــاوانی ئیتــالیش گرنگیـــان دەدا بە پەپـــولە شـــەوانەییە رەشـــەکان ( فراشات اللیل السوداوات ) بەجۆریکی وا ئافرەتان لەو شــەقامانەدا زۆر بوبــوون دۆخــی هــاتوچۆ بە گــران و زەحـــمەت بەڕیـــوە دەچـــوو تەنـــانەت پۆلیســـیش لە چارەسـەری ئەو گرفتە شکستی هینابوو ، ئەو کچانە هیچکامیـان بەڵگەنـامەی یاسـایی و ریـگە پیـدراویان نەبوو هەمووش ناویـان ( رۆز ) بـوو هاوکـات لە وڵاتـی ئیتالیا یانەیەکی زۆری شـەوانە و هـۆڵیکی نمایشـی جەسـتەو کـردەی سیکســی هەیە بەڵام ئافرەتـانی بەدرەوشتی نایجیریایی خاپترینیـانن ، چـونکە هەفـتە نەبــووە لییــان نەکوژریــت یــا ئەشــکەنجە نەدریــن و دەستدریژیان نەکریتەسـەر ، توانـای ئەوەشـیان نەبـوو ســـەردانی پـــۆلیس بـــکەن چـــونکە لەو وڵاتە دور دەخرانەوە ، دواتر و لە ئەنجامی ریپیوانیکی نـاڕەزایی دانیشـــتوانەکە هەرچـــی ئافرەتـــانی بەدرەوشـــتە

لەشاری ( ئۆستە ) لە باکوری ئیتالیا دورخـرانەوە کە سـەرجەم دورخراوەکـان نـایجیری بـوون ، هاوکـات لاشەی کچیك کە بە چەقۆ لیی درابـوو لەژیـر پـردی ( لینزا ) دۆزرایەوە ، هەروەها لە گۆڕیکی بەکۆمەڵـدا لە ( نـاپۆلی ) لاشـەی ( 5 ) ئـافرەتی نایجیریـایی دۆزرایەوە ، لە باشـووری ئیتالیـاش نـزیکەی ( 10 ) خـانوو زیـاتر داخـران کە تـایبەت بـوون بە کـردەی سیکسـی و ناچـار شـەوانە پـۆلیس ریـگەو بانەکـانی دەتەنـی بـۆ ئەوەی ئەو ئافرەتـانەی دورخرابـونەوە دزە نەکەن و نەیەنەوە ناو ئەو شـارانە .

بەهەمان شیوە لە ( تـورین ) لاشـەی ( 4 ) ئـافرەتی خنکینـراو لەنـاو بیریکـدا دۆزرایەوە ، ئەم شـارە لەگەڵ ئەوەی حـالەتی ( هسـتریا ) ی روبەرووی دانیشـتوانەکەی بوو بۆیە دۆخی شـارەکەش تابهاتـایە روو لە خراپی دەبوو کـار گەیشـتە ئەوەی رۆژنامەکـان دەیاننوسـی ئەم شـارە پڕبووە لە ( تـاعون و ئییـدز ) خەڵکـی وەك بڵێـی خۆیـان و شـارەکەیان بسـمیل کـرد ، لەلایەکـی تـرەوە ئافرەتـانی سـپی پیسـتی ئەم شـارە لە قینی ئەو نرخ و گـرنگیەی دەدرا بە رەشـەکان ریپیوانیکیـان ریکخسـت و لەمـبەرو ئەوبەری شـەقامی ئەو شـارە نوسـیبویان ( ئەمڕۆ بـی بەرامبەر ) ، بەپیی وتەکانی ( جیۆفانی کاڤالیری ) کە مـاوەیەکی زۆرە لەگەڵ مچـانی سـپی پیسـت کاردەکات ئەوە تۆڕیك هەیە بەناوی ( لاگۆس – زومـا ) بە وردی چاودیری و کار بۆ رەش پیستەکان دەکات .

هەنـــدیك لەو ئافرەتــانە جــگە لە چەنــد وشـــەیەكی ئیتالی هیچی دیكە نازانن بۆ نمونە وشـەی ( دەم یـا ماچ ) بەڵام هەمووان لەژیر كاریگەری قەرزیكی زۆردان كە نزیكەی ( 100 ) هەزار فرانكـی فەرەنســی دەبـوو هەر كچیكـیش بیویســتایە مـان بگریــت و كارنەكـات روبەرووی هەرەشـە و لیدانیكی زۆر دەبوەوە ، ناوەندی نایجیریایی بە ناوەندیكی سەخت دەژمیردریت هربۆیە شــاری ( لاگـۆس ) بە دۆزەخـی ئەفریقـا ناودەبریـت ، زوربەی كچــانی ئەم وڵاتە دەكەونە داوی بازرگانــانی بـاكوری ئەفریقـا لە ( مەغربیەكـان ) كە دەیانفرۆشــنە وڵاتان و ماڵە و ماڵیان پی دەكەن .

( مافیای ئیتالیش ) لەم بازرگانیەدا بەشداری دەكـات كە داهـاتەكەی خـۆی لە ( ملیـار ) دەدات بەپیـی ئەو زانیاریـانەی دەســت كەوتـوون ئەم بازرگـانیە ســاڵانە داهــاتی یەك ملیــار فرانكــی فەرەنســیە ، لە ئیتالیــا ســیكس كـردن تەنهـا بـۆ ئەو كەســانە قەدەغەیە كە خەڵكــی نایاســیین ، لە ســاڵی 1990 دا یاســاكانی هــاتوچۆ بە تەواوی گۆرانكــاری بەســـەرداهات چەنــد وەزارەتیك لە ئیتالیا چەنـد لیژنەیەكیـان پیكهینـا و هەر لیــژنەیەی چەمكیكــی ئەم یاســایەی گــرتە دەســـت بەمەبەستی چارەسەركردنی گرفت و كیشــەكانی ، یەكیـــك لەو ئەركـــانەی ئەنجامـــدرا لیكـــۆڵینەوەی بارودۆخی ئەو نیشتەجییانە بوو كە لەو وڵاتەدا بوون و بە شیوەیەكی نایاسـایی نیشــتەجی ببـوون كـران بە یاســایی تــاكو ســاڵی 1992 بەم جــۆرە ریــژەی ئەو

ئافرەتانەی بوونە نیشـتەجیی یاسـایی بـووە ( 250 ) هەزار ئافرەت .
لە ( ئیسـپانیا ) ش بەهەمـان شـیوەی ئیتالیـا بە هەزاران لە کچـانی فلیپینـی وەك خزمەتکـار و بەردەست روویان کردبووە ئەو وڵاتە بۆ کارکردن تەنها بەرامبەر ژیانـدنیان ، هینـدەی نەبـردوو لەم دواییـانەدا ئەو کچانەیان گۆڕی بۆ کچانی ( دومنیکی ) کە زمانی ئیسـپانیەکەیان دەزانـی کە ئەمـڕۆ دەتوانیـت بە سەدانیان لی بەدی بکەیت رۆژانی یەك شـەممان لە ناوچەی ( مۆنکلۆ ) و باخچەی ( ئارافاکـا ) کە زۆر نـیە لەلایەن خەڵکی ناوچەکەوە خـانویەك تیکـدرا لە نزیـك ئارافاکا و نزیکەی ( 80 ) ئافرەتی تیدا دەژیا .
هۆکاری بەلیشاو هاتنی کچانی دۆمنیکی بۆ ئیسپانیا ئەوەبـوو کە ریژەیەکـی ئیجگـار زۆری یـانەی شـەوانە تیدایە تەنانەت لە دیهاتەکانیشیدا و ریژەی ئافرەتـانی بەدرەوشـت و سـۆزانی لەو وڵاتەدا بە ( 500 ) هەزار مەزەندە دەکریت بەپیی لیکۆڵینەوەکان تەنها ( 20 % ) بیانین ئەوەی دەمینیتەوە ( دومنیکی و پورتوگـالیە ) سـی بەشـی ئەم کچـانە بەشـیوەی نایاسـایی هاتونەتە ئەو وڵاتەوە و گە پۆلیس بیانگریت راستەوخۆ دەکـرینە دەرەوەی سـنوور ( بەرازیلـی و دومنیکـی ) بەزۆری لەریگەی پورتوگالەوە دینە ئەو وڵاتەوە لەلایەن خەڵکـانی پسـپۆڕەوە کە زۆرجـار ئەو کچـانە لەنـاوچە هاوینە هەواریەکاندا بڵاودەکرینەوە بۆ کـارکردن و پـارە پەیداکردن پیش چونە ناو ئیسـپانیاوە لەسـاڵی 1991 دا پۆلیسی مەدەنی ئیسـپانی بەهاوکـاری پۆلیسـی

بەرپرس لە بیانیەکـان هەسـتا بە ئەنجامـدانی چەنـد هیۆشـیك بۆسـەر چەنـد یـانەیەکی سیکسـی لە ( مەدریـد ) ، لە مـانگی نیسانیشـدا پـۆلیس کەوتە شوین تۆڕیك بۆ هەمان مەبەسـت لە ( بـارم ) ، پـاش لیکـۆڵینەوە دەرکەوت کە نـزیکەی ( 400 ) ئـافرەت لە دومنیکانەوە هینـراون کە هەریەکەیـان بـڕی ( 2000 ) هەزار دۆلار قەرزارە بۆ کارکردن لە یانەکانی ناوچەی ( پاڵما ) .

لە هاوینی هەمان ساڵدا تۆڕیکی دیکە ئاشـکراکرا کە لە هەمان بواردا کاری دەکردوو سـەرەنجام سـەدان لە نیشـتەجیی نایاسـایی لەو وڵاتە وەدەرنران ، لە سـاڵی ( 1992 ) شـدا تۆڕیکی تـر ئاشـکراکرا کە لە کچـانی ( گواتیمـالا ) پیکهـاتبوون کە زۆریـان لیـدەکرا سـیکس بـکەن لە ( بەرشـەلۆنە ) کچەکـان کـاتی خـۆی بە مەرجـی ئەوە هینرابـوون کە گـوایە کـاری خـزمەت و بەردەستی دەکەن لە ماڵەکـانی ( ئەمریکـا ) دا بەڵام دواتر و لە ریـگەی پورتوگـالەوە کـراون بە ئیسـپانیادا ، یەکیـك لە سـەرکردەکانی ئەم تـۆرە سـەرکردەی پـۆلیس بـوو لە ( لاس هیـراس ) بەنـاوی ( لویس جیزوس براکـودا ) و پاسـپۆرتی سـاختەی بـۆ دابین دەکردن ، یەکیك لەو ئافرەتە دەستبەسـەرانەی کەوتبـوونە دەسـت پـۆلیس کچیکـی تەمەن ( 14 ) سـاڵان بـوو کە زۆری لیکرابـوو بـۆ ئەنجامـدانی کـاری سیکسـی و دواتر سکەکەی پـی لەنـاوبرابوو هاوکـات دوو پزیشـکی تایبەت بە ئافرەتان دەسـتگیرکرابوون کە یەکیکیان ( هۆڵەندی ) بوو ، لە یانەکانی ( بـوزوکی )

یۆنانیشدا چەندین لە کچانی سەماکەر هینرابوون کە هەموو بەڵگەنامەی تەنها ( 6 ) مانگ کارکردنیان بۆ کرابوو و ئەم کچانە دوای ئەوەی کە ماوەی کارەکەیان تواو دەبیت یان دەچنە بەشە یۆنانیەکەی ( قوبرس ) یان خۆیان دەکەن بە وڵاتیکی تری ئەوروپادا ، ئەم ئافرەتانە بەزۆری لە نزیك ئەو بنکە سەربازییە ئەمریکیە نیشتەجین کە لە نزیك ( گلیافادا ) یە ، کچانی دومنیکی زوربەی ئەم ئافرەتانە پیکدەهینن ، هەر بەپیی ئەو ئەژمارەی ئەنجامدراوە دەرکەوت کە لە یۆنان لە ئیستادا ( 15 ) هەزار ئافرەتی فلیپینی هەیە کە تەنها ( 20 % ) بەدرەوشتن و ئەوەی دەمینیتەوە خزمەتکار و بەردەستن ، هەروەك نزیکەی ( 1200 ) ئافرەتی ( ئەسیوبیی ) هەیە کە بە ڤیزای گەشتوگوزار هاتونەتە ئەو وڵاتە ، کاری بەدرەوشتی و سیکسی لە یۆنان یاساییە و لە هەمان کاتدا لەلایەن پۆلیسەوە لەژیر چاودیریدایە و بەپیی وتەی وەزیری ناوخۆی یۆنان بیت ئەوا تاکو ئیستا هیچتۆرکی تایبەت بە بازرگانی ئافرەت ئاشکرا نەبووە تەنها حاڵەتی تاکە کەسی نەبیت .

لە ( پاریس ) یش دەتوانین ئەو ئافرەتە سۆزانیانە بەدی بکەین کە پراوپری شەقامی ( سان دنیس ) ەو ئەو ئافرەتانەش کە لە باشوری ئەمریکاوە هاتوون بەسەر باخچەی ( پۆلۆنیادا ) بڵاوبونەتەوە ، ئەمە لەکاتیکدایە کە ناوچەی ( بیجال ) پرە لە ئافرەتی رەش پیست . پاشان چوومە لای ( پشکنەر / ە . مارتینز ) ئەو سەردەمە لە فرۆشگەو دوکانەکاندا

داشـــكاندنی بەرچـــاوی كەلـــوپەل و پیداویســـتی سیكســـــی هەبـــوو ، ئەركـــی ئەم پشـــــكنەرە بەرپرســیاریتی بــوو لە بەرەنگــاربونەوەی نەهیشــتنی بازرگانیكرنی ئافرەت لە فەرەنسـا هەروەك سـەرۆكی ناوەندی نەهیشتنی بازرگـانیكردنە بە مـرۆڤەوە كە بە یەكەمـین جـۆر لە پۆلیسـی ئەوروپـایی دەژمیردریـت تـایبەت بە بەگژداچـونەوەی ئەم كـارە ئەم بەشـــەی پـۆلیس سـاڵی ( 1958 ) لەسـەر بڕیـاری ( جنـراڵ / دیگۆل ) دامەزرا ، ساڵانەش ( 1500 ) كەس دەسـتگیر دەكـات كە لەم بازرگـانیەدا كـاردەكەن كە ( 25 % ) یـان ئـافرەتن كـردەی سیكســی بـۆ خـۆی قەدەغە نیە ، بەڵام هەر كەسیك بە مەبەسـتی پـارە پەیداكردن پەیـڕەوی بكـات و ئافرەتـان تەرخـان بكـرین وەك بازرگـــانیەك بـــۆ ئەم كـــارە ئەوا قەدەغەیە و سزاكەی ( 10 ) ساڵ زیندانیە .

كۆمپانیای ( فالبرك و كوبیت ) ئافرەتـانی سـۆزانی لە دورگەكانی ( ئەنتیل ) ەوە ئەهیـنن ئەم دوانە هەردوكیان هەڵگری رەگەزنـامەی فەرەنســین و كوبی بە ( باوكی گەوادەكان ) نازنـاوی دەركـردووە لە پاریس. بەڵام هاوبەشـەكەی ( فـالبرك ) بە یەكجـاری چوو بۆ ئەڵمانیا بۆ بەڕیـوەبردنی یـانەیەكی شــەوانە و دوكـــانیكی دەلاكـــی و چیشـــتخانەیەك و چەنـــد خانویەكی تایبەت بە كردەی سیكسی لە هەریەك لە پاریس و روهـر لە ئەڵمانیـا ، كاتیـك ئەم دوانە دەچـنە دورگەكـانی ( مارتینــگ ) ئیجگــار دەوڵەمەنـد بــوون و داوایـان دەكـرد كچـانی ئەو نـاوچەكە دوایـان كەون تـا

کـاری بەردەســتیان بــکەن یــان لەســەر مارکیــت و پیشــانگاکان فرۆشــیاری بــکەن و رەوانەی ئەوروپــای بـکەن ، بەڵام زۆریـان بـۆ دەهینـان کـاری سیکســی بـــکەن و زۆریـــان روبەرووی هەرەشـــەو لیـــدان و دەستبەســـەرکردن دەبـــونەوە ، هەربـــۆیە هەردوو پۆلیســـی ئەڵمـــانی و فەرەنســـی هەوڵەکانیـــان یەکخست بۆ دەستگیرکردنی ئەم دوکەسـە و دانیـان بە دادگایەکی فەرەنسایی بەوپیەی یاسای لەو وڵاتە لەو روەوە رەقتــرە ، ئەوەبــوو دوای دەســتگیرکردنیان هەریەك بە سزای ( 8 ) ساڵ زیندانی کرا لە ئەیلولی 1990 دا ، پشــکنەر ( مــارتینز ) چەنــد نمــونەیەکی سـەرکەوتوی پۆلیسـی فەرەنسایی و پۆلیســی چەنـد وڵاتیکی تری بۆ باسکردم لەو بوارەدا لەوانە هاوکـاری پۆلیسی فەرەنسی لەگەڵ پۆلیسی ( بروکسل ) کە هەســتان بە دەســتگیرکردنی تـۆریکی پیکهـاتوو لە ( 5000 ) هەزار ئــافرەتی فەرەنســـی کە لە بـــاکوری برزکسل بەکاردەهینران بۆ ئەو مەبەسـتە لەسـاڵی ( 1991 ) دا لەبەر ئەم هۆکــارانە بازرگانــانی ئافرەتــان چڕی کارەکانیان بـردۆتە بەلجیکـا و ئەڵمانیـا و بـاکوری ئەفریقــا ، لە ســاڵی ( 1989 ) دا تۆریــك دەســـتگیر دەکریـــت کە کچـــانی فەرەنســـی رەوانەی خـــانوە داخراوەکانی ( داکار و سـەنیگال ) دەکات لە شـەستەکانەوە ، لەلایەکی ترەوە فەرەنسـا وەك ترانزیــت وایە بــۆ کچــانی باشــووری ئەمریکــا و ئیســـپانیا و پورتوگــاڵ کە مەشـــقیان پـــی دەکـــرا و رادەهینـــــــــرین و پاشـــــــــان رەوانەی

( بەلجیكا و لۆكمبۆرگ و هۆڵەندە ) دەكرین ، هاوكات بازرگانەكانی ( غانا ) فەرەنسا وەك ناوەندی یەكەم بەكار دەهێنن بۆ گواستنەوەی ئافرەتەكانیان بەرەو ئەوروپا ، بەڵام پشكنەر مارتینز ئەم تۆڕانەی وەك پێكهاتەی هەرەمی و یەك جەمسەری بە دوور زانی و بە پچڕپچڕ و هەریەك بۆخۆیی ئاماژە پێكرد و ریژەی ئافرەتانی ( غانیایی ) بە ( 700 ) ئافرەت دانا لە پاریس كە دووەم ریژەن لەو وڵاتەدا ، لە كاتێكدا ئافرەتانی ( مەغرب ) ی ریژەی دووەمن بەتایبەت لە بەندەری ( مارسیلیای ) سنووریی ( مارتینز ) ئاماژەی بەوە كرد كە لەم ساڵانەی دواییدا و لە (1990 ) گرنگیەكی بەرچاو دراوەتە ئافرەتانی سۆزانی ئەوروپای رۆژهەڵات كە هێشتا ریژەیان لە چاو خۆیاندا زۆر كەمە ، بەپێی وتەی سەرۆكی پۆلیسی فەرەنسا تەنها ( 80 % ) لەژێر كاریگەری بازرگانەكاندان بەهەرحاڵ سەرجەم ئافرەتانی بیانی سۆزانی بە گشتی لە فەرەنسادا ریژەی ( 20 % ) ە .

ئافرەتانی فەرەنسیش تەنها لە ئارایشتگە و مەلەوانگەكاندا ئەو كارە ئەنجام دەدەن یان لەریگەی كۆمپۆنیتی ناوماڵەوە پەیوەندی بە پیاوانەوە دەكەن ، مارتینز دەڵێت لە هیچكام لە یانەكاندا ئافرەتانی ( فلیپینی و تایلاندی و دومنیكی ) نیە و گەربیت و بزانریت كردەی سیكسی و نمایشی جەستە هەیە لە هەر یانەیەكدا ئەوە دەستبەجی ئەو یانەیە دادەخریت . لە ( ئینگلتەرە ) ئافرەتانی سۆزانی بەو

شیوەیە هەڵای نەناوەتەوە بەپێی وتەی پۆلیسی ( سکۆتلەندیار )کە نوسینگەیەکی تایبەتی بەو کارانە هەیە ، لە کاتیکدا کە یانەکان ئافرەتانی ئەوروپایی بەکاردەهینن بەڵام ئەم وڵاتە هیچ کیشەیەکی بەهۆیانەوە بۆ دروست نەبووە لەبەرئەوەی یاسای ئەو وڵاتە لەو روەوە توندوتیژە و هەر ئافرەتیکی لەم جۆرە ئاشکرابیت دەستبەسەر دەکریت ، ساڵی ( 1992 ) رۆژنامەکان چەند خانویەکی تایبەت بە کردەی سیکسیان ئاشکرا کرد کە نهینی بوون و ( مافیای چینی ) بەڕیوەی دەبردن ئافرەتانی ( تایلاند ) ی ( 24 ) کاتژمیر بی وەستان کاریان تیدا دەکرد و بەزۆر دەرمانیان دەدانی بۆ وەستاندنی سوڕی مانگانەیان ، کۆمپانیای ( جوزفین باتلەر ) لە بەریتانیا هەموو شیوازەکانی نمایشی جەستە و پارەپەیداکردن لەو ریگەیەوە پیادە دەکات ، لەم ساڵانەی دواییدا ریکخراویك بەناوی ( کالایان ) سەری هەڵدا و جوڵانەوەیەکی لە دژی کارپیکردنی ئافرەتان لە ماڵاندا دەست پیکرد بەتایبەت ئەو ئافرەتانەی لە ( هیندستان و نیپال و فلیپین ) ەوە دین ریکخراوی کالایان حاڵەتی چەندین لەو ئافرەتانەی لەبەرچاو گرتووە و لیی کۆڵیوەتەوە و بۆی ئاشکرابووە کە زوربەی ئەو ئافرەتانەی روبەرووی چەوساندنەوەو لیدان دەبنەوە ( پاسپۆرت ) و بەڵگەنامەکانیان دەستی بەسەردا گیراوە و بی کری کاریان پی دەکریت یاخود کریی تەواو وەك بڕیار بووە وەرناگرن و هەموو بەرپرسن لە یەك فەرمانبەر و هەموو

ئـازادیەکی هـاتوچۆ و سـەربەسـتیەکیان لـی قەدەغە کراوە و هیچ مافیکیان نیە و گەر هاتوو هەڵهـاتن ئەوە بە نیشـتەجیی نایاسـایی لە قەڵەم دەدرین و دەکرینە دەرەوەی ئەو وڵاتە .
( لاکسمی سوانی ) خزمەتکار و بەردەستی براکانی ( میـــری کوەیـــت ) یەکـــیکە لەو نمونـــانە کە لەم دواییانەدا پڕی ( 300 ) هەزار پاوەنـدی ئینگلیـزی وەك قەرەبو پیدرا .
زوربەی دەوڵەتـــان لەم دواییـــانەدا بەرزبـــونەوەیەکی بەرچاویـان بەخـۆوە بینـی لە زۆربـونی ئارایشــتگە و مەلەوانــگە و خـانوی تـایبەت بە کـردەی سیکســی تـایبەت بەو ئافرەتـانەی لە فلیپـین و پۆلۆنیـاوە دیـن و بەشـیوەیەکی بەرچاو ریژەیان لە زیادبونـدایە ، خـانوی ئافرەتان لە ( ئۆسلۆ ) تاییەتە بەو ئافرەتانەی لە دەوڵەتـــانی جیهـــانی ســـیهەمەوە دیـــن ، لە دوای هەشـتاکانەوە و پـاش لیکـۆڵینەوە لەسـەر بـارودۆخی ئەو ئافرەتـــانەی لەدەســـت تونـــدوتیژی میردەکانیـــان هەڵدین پڕیاردرا مـافی نیشـتەجییان پـی بـدریت ، بە مەرجیك پیویسـتە ئەو ئـافرەتە ( 3 ) سـاڵ پیشـتر لە ژیـانی هاوسـەریدا بوبیـت پـیچەوانەی ئەم مەرجەش هەر ئافرەتیـــك ( تەڵاق ) بـــدریت یـــاخود لە میـــردی دورکەویتەوە دەستبەجی لەو وڵاتە دوردەخـریتەوە ، ( دانیمارك ) بە ( بەهەشـتی هاوسـەریبوونی روکەش ) ناودەریـــــت و بە هەزاران لە ئەوروپاییەکــــان رووی تیـــدەکەن بە مەبەســـتی هاوســـەری بـــوون لەگەڵ ئافرەتانی بیانیدا کە چەند کاتژمیریك زیـاتر ناخایەنیـت

بەڵام لەزۆر وڵاتـــی ئەوروپـــی تـــردا ئەوە کـــاریکی زەحمەتە.

( سویسرا ) بە ( بەهەشتی کچانی یانە ) ناسـراوە بەهـۆی ئەوەی کچـانیکی زۆری کۆمـاری دومنیکـان و بەرازیل و تایلاندی لییە و بەپیی یاسـا کریکـار ریـگەی پـــی نادریـــت کاربکـــات تەنهـــا پیـــاوان و ئافرەتـــانی ئەمریکـــای بـــاکور و یەکیتـــی ئەوروپـــا نەبیـــت ، ئەمە سەرباری ئەوەی کە ئەم یاسایە ئافرەتی خزمەتکار و کـــارکەری نـــاو یانەکـــان نـــاگریتەوە هەروەك هـــیچ دەوڵەتیکی تر نیە وەك ئەم وڵاتە بیت کە بەو شیوەیە ریگە بە کریکار و ئافرەتانی بیانی بدات لە وڵاتەکانیاندا کار بکەن هیندەی ( سویسرا ) کە ریگە دەدات کریکار مـــاوەی ( 8 ) مانـــگ لە ســـاڵیکدا بە سەربەســـتی کاربکـــات ، گەر هـــاتوو ئافرەتیـــك تـــوانی مـــاوەی ( 2 ) ساڵی بەردەوام کاربکات ئەوە مۆڵەتی کارکردنی بۆ ( 18 9 مانگ بۆ نوی دەکـریتەوە ئەم ئافرەتـانە سـەرەتا بە ( ڤیزا ) ی گەشتوگوزار ئەچنە ئەو وڵاتەوە و لە پاشـــان داوای مـــۆڵەتی کـــارکردن دەکەن ، بەڵام دومنیکانیەکـان پیویســتیان بە ڤیـزاش نـیە بـۆ چـووەن ژوورەوە . هەروەك ریژەیەکـــی زۆری ڕی هـــونەری لەو وڵاتەدا هەن کە ســـەردانی وڵاتـــانی دیـــکە دەکەن و لەگەڵ خۆیان گریبەست و بەڵگەنامەی ســپی دەبەن و بە داشکانی ( 80 % ) کاری پی دەکەن و بەردەوام ( 800 ) لە کچـــانی یـــانە لە سویســـرا لەو بـــوارەدا کاردەکەن . یانە هەیە لە ( جنیف و پاڵ و بیرن و لۆزان ) بەڵام ژمارەیەکی ئیجگـار زۆری یـانە لە ( زیـوریخ ) ە

بەجۆریك ریـگە دراوە بە ریكخـراوی ( Fiz ) دەوریـیەی گەڕۆكی نیوە شـەوی سـوپای ئاشـتی كـار بـكەن لە دژی بازرگانیكردن بە ئافرەتان ئەم ریكخـراوە سـاڵانە ( 100 – 150 ) سـكاڵای لەلایەن ئافرەتـانی یانەكـانەوە پی دەگات كە زۆریـان لـی دەكریـت ریژەیەكـی زۆر لە خواردنەوەی ( شـامپانیا ) سـاغ بـكەنەوە و پیویسـتی ئەوەی كە هەر ئافرەتیك لە یانەكاندا مانگـانە بتوانیـت بـڕی ( 10 ) هەزار فرانكـی فەرەنسـی پەیـدا بكـات ، سـەرەتاش هەر كچیـك لەو كچـانە گریبەسـتیكی كاركردنی بۆ تەنها ( 3 ) رۆژ كاركردنی بۆ دەكریت گەر هـاتوو ئەو ئـافرەتە نەیتـوانی وا بكـات ( میـوان / موشـتەری ) تەواو بخـواتەوە و پـارەیەكی باشـی پـی خەرج بكـات ئەو ئـافرەتە دەردەكریـت ، لە زیـوریخ قەدەغەیە ئـافرەت لەگەڵ میـوان دانیشـیت و دەسـتبازی بكـات بەڵام پـۆلیس چـاو لەم بـڕگەیە دەپۆشیت كە هەنـدیك لەو ئافرەتـانە تلیـاك و بـابەتی هۆشبەر دەخۆن تا دۆخیكی باشـتر و خۆشـتر لەگەڵ میوان بەسەربەرن تەنانەت وایلیهاتووە هەر لە زیـوریخ یـانەیەكی بەناوبانـگ لە جیـاتی شـامپانیا تلیـاك دەفرۆشیت .

دوای كیوماڵ كردنیك كە ریكخراوی ( Fiz ) لە ساڵی ( 1991 ) دا ئەنجامیـداوە پـاش كوشـتنی ئـافرەتیكی بەرازیلی بە دەستی میردەكەی ، ئەم ئافرەتە پیشـتر بۆ ماوەی ( 2 ) ساڵ لە یانەكانـدا كـاری كردبـوو دوای ئەوە شـووی كردبـوو ، زۆرجـار بە دەیـان سـكاڵا ئاراسـتەی ریكخـراوی نـاوبراو دەكریـت لەلایەن

ئافرەتــانیکەوە لەم جــۆرە کە لەلایەن میردەکانیــانەوە لیبیا دەدریـت و لە ئیسـتادا نـزیکەی ( 8 – 10 ) هەزار ئـــافرەتی شـــوکردووی میـــرددار فلیپینـــی هەیە لە سویســرا ، بەپیــی ( Fiz ) ســی بەشــیان ســکاڵایان تۆمــارکردووە لەدەســت میردەکانیــان لەســەر رەقــی مامەڵە کردن لە ســیکس کـردن لەگەڵیـان . هەربـۆیە ســـاڵی ( 1989 ) لە شـــاری ( بلـــودنز ) ی ســـەر ســـنووری ( نەمســـا ) نـزیکەی ( 10 ) هەزار یـانەی نایاسایی دادەخریت و سەدان لە کچان و ئافرەتـان لە ریـــگەی سویســـــراوە دەچـــنە نەمســـا و لەلایەن کۆمپانیــای ( هوریســا ) وە و قونســولی نەمســا لە سویســرا مـۆڵەتی کـار درا بە هەموویـان . زۆریشــیان دەگوازرانەوە بۆ ئەڵمانیـا کە بە یەکیـك لە گرنگتـرین و بەناوبانگترین لە وڵاتانی جیهان دەژمیردریت لە بـواری گەشە سـەندنی یـانەی شـەوانەیی و کارینایاسـایی ســیکس و هاوســەریتی ئاســایی بەجۆریــك کە نەك ئافرەتـــان لە ( کەتـــالۆك ) دا دیـــاریکرابوون بـــۆ بە هاوســـەریکردن بەڵکــو دەشــتوانیت وەریبگریــت بــۆ تاقیکردنەوە تا بزانریت کەڵکی لی وەردەگیریت یان نـا .

جگە لە بەهاوسەریکردن ئافرەتی تر هەبوون بەکری و نرخـــی دیـــاریکراو ، ئافرەتـــانی دیـــکەی تایلانـــدی و غانیایی و باشووری هەردوو ئەمریکاش بەشیوەیەکی ئاشـــکراو بەرچـــاو لە خانوەکـــانی تـــایبەت بە کـــردەی سیکســـی لە شـــارە گەورە و ســـەرەکیەکاندا کاریـــان دەکرد .

ڕانی ئەم خانوانە هەموو لە پیاوانی بەڕیز و گرنگن لەوانە خیزانی ( شوتز ) کە چەند خانویەکی لەم جۆرەی هەیە لە ( بۆن ) .
لوتکەی کردەی سیکسی لە ئەوروپا لە ( یبرباهن ) ە لە ( هامبۆرگ ) ، بەوپیەی گەشتیکم ئەنجامدا لەگەڵ ( پاتریك توب ) ساڵی 1991 ئەم کابرایە ئەوکات بە دەیان لە خانوو و یانەی تایبەتی بۆ کردەی سیکسی بەڕیوە دەبرد و بە ڕیکی باش ناوبانگی دەرکردبوو و بەردەوامیش بەشوین خانووی نویدا دەگەڕا بۆ هەمان مەبەست هاوکات نوسینگەیەکی تایبەتی بە پاسەوانی هەبوو ، ( توب ) پیی وتم کە ( یبرباهن ) نمونەیی ترین شوینە بۆ پیادەکردنی خاوینترین سیکس ، لە لە هامبۆرگ ریژەی ئەو ئافرەتانەی لەم بوارەدا کاردەکەن و تایلاندی نەژادن ئیجگار زۆرە ، زوربەی هەرە زۆری ئەو کچە تایلاندیانە جگە لە چەند وشەیەك نەبیت بە ئینگلیزی یاخود ئەڵمانی زمان نازانن وشەکانیش کە دەیزانن بریتیە لە چوار پرسیارە کلاسیکیەکە چۆنیت ؟ ناوت چیە ؟ خەڵکی کوییت ؟ خواردنەوەم بۆ دەکڕیت ؟
لە ( فرانکفۆرت ) یش دەزگای ( ئەجسترا ) ساڵی 1983 کەوتە بەگژداچوونەوە و داکۆکیکردن لە بازرگانیکردن بە ئافرەتان ، نوسینگەی ئەم دەزگایە ئەکەوتە ناوچەیەکەوە بە ( مەملەکەتی ئافرەتانی سۆزانی ) ناسرابوو کە ئافرەتان لەمبەر و ئەوبەری باڵەخانەیەکدا دەوەستان و پیاوانیان راودەکرد ژوورەکانی سەرەوەی ئەم باڵەخانەیەش تایبەت بوو

بەم کـارە ، بەپیـی ( ئەجسـترا ) بیـت لە ئەڵمانیـا نزیکەی ( 200 – 400 ) هەزار ئافرەتی سۆزانی هەیە کە ( 60 % ) ی بیـانیە و رەواجیکـی زۆریـان هەیە و سەرجەم لە وڵاتانی ئەوروپای رۆژهەڵاتەوە یاخود لە ئەڵمانیـای رۆژهەڵاتـی پیشـوەوە هـاتوون بەتـایبەت پاش ئەوەی دیـواری نیـوان هەردوو ئەڵمانیـا رووخـا و بـوونە یەك ئیـدی ریژەیەکـی ئیجگـار زۆری ئافرەتـان زیـادی کـردوو کیشمەکیشـم و ململانـی لە نیـوانی بازرگانانـای هەردولادا دروسـتبوو کە ئیسـتا یەکیـان گرتــوە و ســەرکەوتوانە کارەکانیــان رادەپەڕیــنن . بازرگــانی ئەڵمانیــا لەســەر پســولەی مــۆڵەتی کارکردنیــان نوســراوە کە ئەوان لەژیــر چــاودیری وەزارەتی کاری فیدراڵیدا کاردەکەن .

بۆ ئەوەی قورسـیەك و بەهـایەك بـۆ کارەکانیـان پەیـدا بـکەن و شـیوازیك لە بە رەسـمی دانـانی کارەکانیـان پیشان بدەن .

تۆڕیك بەناوی ( ئیسـن ) بەسـەدان لە سـەماکەرانی فۆلکلـۆری فلیپینـی فرۆشـتبوو کە ئەم کیشـەیە بە یەکیـك لە کیشـە گەورەکـانی ئەڵمانیـا دادەنریـت کە یاســا کــاری تیــداکردووە . لە بەلجیکــا خەریــکە جــوڵانەوەیەك دروســت دەبیــت لە دژی ئەم کــارە بەتــــایبەت پــــاش ئەوەی لە رۆژنــــامەی ( فلامانـدکناك ) دا چەنـد بـابەتیکم لەسـەر ئەو باسـە بڵاوکردەوە لە ساڵانی ( 1991 – 1992 ) کە دواتریش پادشــای بەلجیکـا لە دانیشــتنیکی تایبەتیـدا گـویی لیگرتم تا چەند رونکردنەوەیەکم تیگەیاند .

هەردوو هاوسەر پادشای بەلجیکا و خیزانەکەی بەشداری ئەم کیشەیەیان کردوو شاژن خاتوو ( فابیلا ) لە کۆبونەوەیەکی نەتەوە یەکگرتووەکاندا کە لە ( جنیف ) لە ( 25 / 2 / 1992 ) بەسترا دەنگی خۆیدا بە باشترکردنی ژیانی ئابووری ئافرەتانی گوند نشین هەر لەم بۆنەیەدا شاژن وتی : زۆرجار ئەم ئافرەتانە دەبنە قوربانیەکی بازرگانیەکی گەورەی ئاپروبەر کە بە ملیۆنان کردەی نایاسایی و بەدرەوشتیان پی دەکریت لە شارە گەورەکان و دەوڵەتانی رۆژئاوادا ، ئەوە جۆریکی نوییە لە بەکۆیلایەتیکردن پیویستە بە توندی بەگژیدا بچینەوە .
دواتر لەژیر پەستانی پادشایانەدا وەزیرەکان زۆریان لیکرا کە چاویك بگیرنەوە بە یاساکانی سەماکەرانی یانەکان و نوسینگەکانی بەهاوسەریکردن ئەم کیشەیە لە پیلانیکی میریدا خرایە روو لە ساڵی 1992 دا ، پاشان وەزیری داد بڕیاریدا کە هەر ئافرەتیك سکاڵای تۆمارکرد ریگەی نیشەجی کردنی پی بدریت بەهۆی چەند هۆکاریکی مرۆڤانە . بەڵام تاکو ئەمڕۆ ئەم بڕیارە جیگیر نەکراوە لە دەقیکی یاساییدا و هیندەی نەبرد لە ساڵی 1993 دا شکستی هینا بەهۆی خراپ بەکارهینانیەوە ، جیی باسە بەلجیکا تا ئەمڕۆ سیاسەتیکی زیندووی بە دەستەوە نیە بۆ بەدوادا چونی ئەم کیشەیە .
لەسەر ئاستی گشتی ناوەندی ( بایوك ) لە ( ئانفر ) بەهەموو توانای خۆیەوە هاتە مەیدان بۆ روبەروبوونەوە لەگەڵ ئەم جۆرە بازرگانیە و ساڵی 1992 دەزگای (

سارالك ) دامەزرا بۆ هەمان مەبەست ، لەم بوارەدا چالاکترین کەس ( باتسی سۆرنسن ) ە کە بەرەنگاری ئەم بازرگانیە بۆتەوە و بە دەستی خۆی سی ئافرەتی داوە بەدەستی پۆلیسەوە و لەلایەن یاساوە مۆڵەتی دراوەتی لەو بوارەدا چالاکی بکات هەر ئەم چالاکیانەی وایان لیکردووە کە سالانە چەندین لەو ئافرتانەی بونەتە قوربانی و دەستیان پراوە و مافیان خوراوە رووی تی بکەن ، زۆرجاریش روبەروی هەڕەشەی کوشتن بۆتەوە لەو نامە هەڕەشە ئامیزانەی بۆی نوسراوە ( ئەمجارە کە گیا سەوز بوو کوژراویت و نیژراویشیت ) ، دوای ئەوەی لەگەڵیدا کۆچم کرد بۆ ( غانا ) لە کۆتایی ساڵی 1991 دا روبەروی گیروگرفتی سیاسیش بوەوە بەوپییەی لایەنگری ئافرەتانی نایاسایی ئەو وڵاتەیە ، چونکە ئافرەتی غانایی نەژاد لە ئانفر کۆبونەتەوە و لە بەلجیکاش یاسایەك نیە بە بازرگانی ئافرەت ، هەمان شتیش لە هۆڵەندا ، تەنها ئەو کەسانە دادگا لییان دەپرسیتەوە کە لە ریگەی ئافرەتانەوە پارەی پەیدا بکردایە یان بەریگەی نایاسایی خەڵکی بهینایەتە ئەو وڵاتەوە ، پۆلیس ژمارەی کچانی شەوی بە ( 14 ) هەزار مەزەندە کرد لە بەلجیکا لە 1980 دا و ئەو ئافرەتانەش کە لەسەر شەقامەکان دەوەستن و رەش پیستن بە پلەی یەکەم ( غانا ) ین و ( زائیر ) یەکان بە پلەی دووەم دین ، زوربەی هەرە زۆری ئافرەتانی غانا داوای مافی پەناهەندەیی سیاسی

دەکەن ، لە ســاڵی ( 1991 ) ەوە بــونەتە قوربــانی و نیچیری راوچییانی نایاسایی بەتایبەتی لە ( ئانفر ) .
بەلجیکـــا ناوبـــانگیکی زۆری هەیە لە زۆری یـــانە و ئافرەتانی سۆزانی لە ساڵی 1990 دا مـۆڵەت درایە ( 2000 ) کچـــی تایلانــدی و فلیپینـــی و دومنیکـــی بە مەبەستی کارکردن لەو بوارەدا لە بەلجیکـا و بەهـۆی یەکیتــب فیــدراڵیەوە ئەتوانریــت مـۆڵەتی ( 3 ) مانــگ کارکردن لە هەریمەکانی ( مالۆن و فلامان و برکســلواند ) بــدریت ، لە هــاوینی ســاڵی 1992 دا پــرۆژەی یاســـایەك ئامـــادەکرا بـــۆ قەدەغە کردنـــی مۆڵەتــدان بە کــارکردن بەو کەســـانەی لە یانەکانــدا کاردەکەن کە لە دەرەوەی یەکیتی ئەوروپا بیت .
تەنهـــا هۆڵنـــدا بە یەکیـــك لە وڵاتـــانە دادەنریـــت کە دژایەتـی تەواوی بازرگـانی بە ئـافرەتی تیـادا پەیـڕەو بکریت ، ساڵی 1985 وەزیـری کاروبـاری کـۆمەڵایەتی ئەم وڵاتە بڕیاریـــدا لیکـــۆڵینەوەیەك بکریـــت لەم روەوە ریژەی ئافرەتانی سۆزانی لە هۆڵەندا بە ( 20 ) هەزار ئافرەت مەزەندە کرا ، لیکۆڵینەوەیەك لە سـاڵی 1989 دا ئاشـــکرای کــرد کە ئافرەتــانی ســـۆزانی لە شـــارە گەورەکانی وەك ( رۆتردام و هـای ) لە ( 20 – 50% ) پیـك دەهیـنن و زوربەی ناوچەکـانی ئەمـوڵاتە یـانەی سیکســـی و پیشـــانگەی پپیشـــاندانی ئافرەتـــانی سۆزانی تیدایە لە بیانیەکان .
ئەم دەزگایە لە دژی بازرگانی بە ئـافرەت لە سـاڵی ( 1978 ) ەوە دەستی بە کارکردن کردووە ، لەسـاڵی ( 1991 ) دا نـزیکەی ( 250 ) قوربانـب پیشـوازی لیکـرد

کە سـەرجەم لە دومنیکـانی و فلیپینـی و تایلانـدی بـوون و زۆر لەم کیشـانە لە دادگـادا بە هەڵپەسیردراوی کۆتایی هـات ، بەڵام لەم سـاڵانەی دواییدا ( 21 ) دادگایی ئەنجامدرا بۆ ( 24 ) تاوانبار کە سزاکان لە نیوان ئازاردان و زیندانیکردن بۆ ( 4 ) سـاڵ بـوون ، بەم شـیوەیە ئافرەتـانی سـۆزانی راهـاتن لەسـەر ئەوەی بـی سـڵەمینەوە و ترسـی ئەوەی لە وڵات دوربخرینەوە سکاڵاو داواکانیان ببەنە دادگا .

لە ئایـاری 1992 دا پارلەمـانی هۆڵەنـدا بە زۆریـنەی دەنگ بڕیاریدا بە لابردنو داخستنی خانوەکانی تایبەت بە کـردەی سیکسـی و نایاسـایی ، بـۆ ئەم کـارە پیویستە مـۆڵەت تەنهـا بـدریتە ئەو خـانوانە کە زۆر لە ئافرەت نـاکەن و بەزۆر پارەیـان لـی وەرنـاگرن و پیچ و پەنـا و فیـل ناکریـت تیایانـدا بە یاسـاوە و سـزای بـۆ سەرپیچیکەران دانـا ، هەروەك کـردەی سیکسـی لە سـەرجەم ئافرەتـان قەدەغە کـرا تەنهـا بـۆ ئافرتـانی هـاتوو لە پەکیتـی ئەوروپـاوە نەبیـت ، بەڵام ئەم دۆخەی هۆڵەندا پی دەچیت گۆڕانکاری بەسەردا بیت بەهـۆی کـاریگەری ئەوروپـاوە وەك بە ( ئەمسـتردام ) رویـداوە کاتیـك لە سـاڵی 1991 دا ناوەنـدی پیشوازیکردن لە ئافرەتانی رەش پیسـت هەڕەشـەی داخسـتنی لیکـرا ، بەپیـی لیـدوانی سـەرۆکی ئەم ناوەنـدە ئەوا ئەم شـارە چیتـر پیویسـتی بە هاوکـاری ئەم ناوەندە نەماوە چونکە دەستگیرکردنی ئافرەتـانی نایاسـاییان رەتکـردۆتەوە ، هەروەك تاوانبـارکراوە بە پیـدانی نیشـتەجیی یاسـایی بەو ئافرەتـانە ،

هەرچۆنیك بیت حكـومەتی هۆڵەنـدی لە لـوتكەی ئەو شـۆڕشـــەدایە لەم بـــوارەدا بەلای ئەوروپـــاوە ، ئەم سـەركەوتنەش دەگەڕێتەوە بۆ چالاكی ( لیزا ماماك ) .

# بەشـی چوارەم

## دەوڵەتی ژێردەسـتەی سـیكسـی و ململانیی

لیزای نەزۆك

لە مانیلا بۆ یەکەمینجارە دادگا لە کیشـەیەکی تایبەت بە بازرگـانی ئافرەتـان پروانیـت لە کۆشـکی دادبینـی تەنگ و خنکاودا دادوەر ریگەی نەدا تاوانبار ( نسـتوریو بلاسـر ) دەم هەلهینـی ، راسـتەوخۆ پریـاری دادگـای بەسـەردا سـەپاند چـونکە ئەم تاوانبـارە دریـژە بە دانیشـتنەکانی دادگـا دەدات و کـات بەفیـرۆ دەدات ، دادوەری ئەم دادگا بـالایەش رۆلیکـی گرنـگ دەبینیـت لەم کیشیەدا کە پیویست بوو چەند سالیك لەمەوبەر کۆتـایی پـی بهاتـایە بەلام چەنـدین جـار دواخـراوە و دورخراوەتەوە ، پاشـان دادگـا لە هەریمـی ( بۆتـون ) کە زیدی تاوانبارە گواسـترایەوە بـۆ مـانیلای پایتەخـت لەژیـر پەسـتانی چەنـد شـتیکدا ، چـونکە ناتوانریـت دادگایی کردن لەو هەریمە ئەنجام بدریت لەبەرئەوەی دادوەرەکە لیـدانیکی زۆری خواردبـوو لەلایەن چەنـد کەسانیکی نەناسراوەوە و بەرۆژی نیوەرۆ . هەروەك ( لیـزا مامـاك ) ی فلیپینـی نەژاد کە ( شـاهید ) بـوو بەسـەر ( بلاسـر ) ەوە ئەویـش چەنـد جاریـك روبەروی هەرەشـە بـۆتەوە ، تەنـانەت ئەو رۆژەی کە دیـت بـۆ شـاهیدی ( 4 ) پاسـەوانی چەکدار هاوریيەتی دەکـرد تا هۆلی دادگا لە مانیلا و شـەوانە و هەر شـەوەی بـۆ نوسـتن لە جیگەیەکـی جیـاواز و نهینـدی دەنوسـت چونکە بەرامبەرەکەی پیاویکی قورسـە کە فەرمـانبەرە و میـردی ئـافرەتیکی دادوەرە ، ئەم دوو هاوسـەرە کـاتی خـۆی ( لیـزا ) یـان فرۆشـتووە بە بازرگـانیکی سیکسـی هۆلەندی بەناوی ( یان شـومان ) کە زۆری لە لیزا کردووە لە کیلگە سیکسـیەکاندا کاربکـات لە (

فرایـز ) ، پـاش ئەوەی لیـزا هەڵـدیت رق و تـۆڵەیەكی تونـــــــدی بەرامـــــــبەر ئەم بازرگـــــــانه و تەواوی هەڵسـوڕینەرانی ئەو كـارە لا دروسـت دەبیـت و بڕیـار دەدات كه ( شـــــومان ) بگەیەنیـــــته دادگـــا به هەر ریگەیەك بیت ئەوە بوو له ساڵی ( 1988 ) دا شـومان دەدریته دادگا و تاوانبار دەكریت ، پاشـان له دوای ئەم دادگایی كردنه لیزا هەڵدەسیت به سـكاڵا تۆمـاركردن له دژی ( بلاسـر ) له مـانیلا بەڵام دادگـایی كـردنەكه دوادەخریت بۆ دوو سـاڵ ، لەپاشـان دادگـا دەگەڕێـتەوە ســــەر ئەم كیشـــــەیەی لیــــزا لەگەڵ ( بلاســــر )دا كیشـەیەكی به پـیچ و پـانو ئـاڵۆز دەبیـت له دوای ئەم دادگایی كـردنەش ( 12 ) دادگـایی تـر له چـاوەڕوانی كۆتایی هاتنی ئەم كیشــەیەدا بـوون ، كاتیـك ئـیمه و خەڵكـی له هـۆڵەكه دانیشــتبووین له پشــت ئـیمەوە پیاوانی تۆرەكه به دەست بەستراوی له داوامانەوەبوو ( بلاسر ) یشبه دەست بەسـتراوی و به هـاوڕییەتی منداڵەكانی و پاسەوانەكانی به توڕەیی و پڕ له ڕقەوە بەملاولای خۆیدا دەیڕوانی چونكه ناوبانگی كەسـیتی و كارەكانیشـی لەتای تەرازودایه ، هەریەك له ( لویس ) ناویك كه ئافرەتیكی قەشەی هۆڵەنـدی نەژاد بـوو و ( یۆهـان ) نـاویكی تـر كه هـاوڕیی لیـزا بـوو به وردی چاودیری كیشــەكەیان دەكـردوو زۆر هاوكـاری لیزایـان دەكرد ، هیندەی نەبرد دادوەر گۆڕا بۆ دادوەریكی تـر و بەناچاری پیویست بوو كیشـەكه دوابخریت لانـی كەم بۆ ساڵیك .

لەپاش چەند رۆژێك لەگەڵ یۆهانی هاوڕێی لیزا چووم بۆ سەردانی چەند کەسێك و قسەمان لەگەڵ قەشە ( ماك كۆڵن ) ی ئیرلەندی نەژاد کرد لەبارەی بازرگانیکردن بە ئافرەتان و سیکسکردن لای منداڵان ، ئەم قەشەیە بە توندی دژی بازرگانی ئافرەتانە و سەردانی یەکێك لە کێڵگەکانی سیکسی کردووە و بینیویەتی کە چۆن کچانی فلیپینی خراونەتە قەفەزە و هەر شتێکت ویست دەتوانیت لەگەڵیان بکەیت ، هەرچەندە ( یۆهان ) ی کاسۆلیکی کە ماوەیەکی دورودرێژە لەگەڵ لیزادایە و لیزا دڵی بردووە ناتوانیت لیی دوربکەویتەوە ، هەر ئەوەش وایلیکردووە کە بەردەوام لەگەڵ لیزادا بێت تەنانەت لەم کێشەیەشدا کە چەندین جار روبەروی هەرەشە بۆتەوە تا ئەو رۆژەی لەگەڵ لیزادا گەیشتە دادگا بۆ ئەو کێشەیەی پاش ( 6 ) ساڵ دادگایی کۆتایی هات و لیزای شل و کوت کرد ، ئازایەتی و سوربونی لە چاودێری کردنی وردی بازرگانی ئافرەتان لە هۆڵەندا و فلیپین دوو بناغەی پتەوو سەرەکی بوون لەو کێشمەکێشە گەورەیەی بەڕێوەی برد لە دژی بازرگانی ئافرەتانی جیهانی لیزا بەم کارەی تینیکی دایە سەرجەم ئەو ئافرەتانەی بونەتە قوربانی کە داوا و سکاڵای خۆیان لە دوای ئەم روداوەوە بەبەنە دادگا ، هەر بەهۆی ئەویشەوە دەزگای دژە بازرگانیکردن بە ئافرەتان گەشەی سەندوو کاریگەری زیادی کردوو ئەنجام حکومەتی هۆڵەندی سەرۆکایەتی ئەم ململانییەی لە ئەوروپادا گرتە دەست ، هەر بەهۆی سوربوونی

لیزاوە ئەبینین کە فلیپین ئەو وڵاتەی سـەرچاوەیەکی هەڵقـــوڵاوی کچـــان و ئافرەتـــان بـــوو لەلایەن بازرگـــانیکردنی ئافرەتـــانەوە چەنـــدین کـــۆمەڵەی ئافرەتـانی تیـدا دروسـتبووە کە سـەرجەم پەسـتانیان خستۆتە سەر حکومەت تا هەڵویستی خۆی وەرگریت و دیـــاری بکـــات بەرامـــبەر ئەم کیشـــەیەو هەمـــوو کیشەکانی لەم جۆرە . هەر بەهۆی ئەو چـاوپیکەوتنە تەلەفزیۆنی و دیدارە رۆژنامەگەریە رەقانەی لیزا بڵاوی کـردونەتەوە لای ئەو وڵاتـانەی ئافرەتـان دەهیـنن و دەبەن ویـژدان بەئاگـا هـاتۆتەوە ، بەڵام لەگەڵ ئەم سەرکەوتنە گەورەیەی لیزاشدا خودی خۆی هەسـت بە نارەحەتی دەکات .

ئەم چیرۆکەی لیزا لە هەشـتاکاندا سـەری هەڵدابوو واتە لەو ســـەردەمەی بازرگـــانی بە ئـــافرەتەوە لە گەرمەیدا بوو و بە هەزاران لە ئافرەتان پەیدا دەکران و وەك کەل و پەلـی سیکسـی دەفرۆشـران کە زوربەی ئام ئافرەتانە بە پلەی یەکەم ( ئاسـیا ) ییەکـان بـوون بە تایبەت تایلانـدی و فلیپینـی و بە پـلەی دووەمـیش ئافرەتانی باشووری ئەمریکا دومنیکی و کۆلومبیەکـان و بە پـلەی سـیهەمیش ئەفریقـا بەتـایبەتیش غانـا و نایجیریا و پلەی چوارەم لە ئەوروپای رۆژهەڵات .

لە حەفتاکانـدا زوربەی وڵاتـانی رۆژئـاوا کۆچکردنیـان قەدەغە کـرد تـاکو هەشـتاکان ، لە هەشتاکانیشـدا پیویســـت بـــوو لە پیشـــەوە ( ڤیـزا ) وەربگیریـت بەم هـۆیەوە یریکـی زۆر لە ئافرەتـان کەوتـنە داو و ژیـر کاریگەری بازرگانی سیکسیەوە . هۆکـاریکی دیـکەی

پەرەســەندنی ئەم بازرگــانیە ئەو نەداری و هەژاریــیە ئــابوریەی ئەو وڵاتــانەی گرتــۆتەوە بەجۆریــك كە نــان پەیداكردن كـاریكی سـەخت بیـت تیایانـدا لەوانەشـە هۆكــاریكی ســـەرەكیش لەدوای پەرەســـەندی ئەم جۆرە بازرگانیە ئەوەبیت كە پارەو سـامانیكی خەیـاڵی لیوە دەسـت دەكەویت لەلایەت تۆڕەكـانی تـایبەت بەو كــارە ، ئەتــوانین بازرگــانیكردن بە ئافرەتــان پیناســـە بكەین بەوەی كە هەر زۆر لیكردنیكی ئافرەتان دەچیتە خانەی ئەو بازرگانیەوە چجای  بە كردەی سیكسـی و زۆرلیكردن بە لەشفرۆشـی ئەخەڵەتینرین و دەسـتیان دەبڕدریت بە گفتی درۆی ناردنیان بۆ شـوینی خۆشـی وەك هاوینەهەوار یاخود بۆ پیشـانگە و بازاڕەكان یان لە ماڵانــدا بــۆ خــزمەت و بەردەســتی ، هۆكارەكــانی پەســتان خســتنە ســەر ئەو كــارانەش زۆرە لەوانە بەشــیوەی راســتەوخۆ یــان ناراســتەوخۆ بــۆ نمــونە دەسـت بەسـەردا گرتن و شاردنەوەی پاسـپۆرتەكانیان و چـــاودیری كردنیـــان و بەنـــدكردنیان ترســـاندن و هەرەشـە لیكردنیان ، هەروەك هەنـدیك لەو ئافرەتـانە پیویســتیان بە پــارە هەیە بــۆ دەســتگیرۆیی كردنــی خیزانەكانیــان و پەیــداكردنی بژیــوی بۆیــان هاوكــات قەرزیكــی زۆر دیــتە ســەر شــانیان و دواتــر بەهــۆی ئەوەی ریگە پی نەدرا و نایاسایین و لە ترسـی ئەوەی لەو وڵاتە دورنەخــرینەوە بەردەوام دەبــن لەو كــارە و تاڵی و ناخۆشیەكانی بە ناچاری بنۆشــن تـا خۆیـان و خیزانەكانیشـیان نان بڕاو نەبن و وایان لی دیت باشــتر و قوڵتر بچنە ژیر دەسـت و ویسـتی بازرگانەكان لەگەڵ

ئەوەی لە سانا ترین ماف بی بەریـن .بازرگانەکـانیش بە گفتی درۆ و پیدانی مافی پەناهەندەیی سیاسـی و هاوسـەریتی روکەش و پرکردنەوەی گریبەستی درۆ بەکـاردەهینن تەنهـا بـۆ دریژەپیـدانی کارەکانیـان و کەمیك بە رەسمی کردنی کارەکانیان ، تەنانەت زۆری ئەم سـاختەکاریانە لەلایەن ئەو بازرگانـانەوە کـاریکی وایکردووە کە هاوسـەریتی راستەقینە و نا راسـتەقینە و مافی پەناهەندەیی راستەقینە و ساختە حکومەتی ئەو وڵاتە بە زەحمەت بۆی جیابکریتەوە .
ریـگەی هونەرمەنـدان و تـیم یـان گروپـی هـونەری ریگەیەکـی بـاوە لەنـاو بازرگانانـدا بـۆ ئەمـلاو ئەولا پیکردنـــی ئافرەتـــان ، چـــونکە لە زۆربەی وڵاتـــانی ئەوروپـادا تەنهـا لەشـیوەی گروپـی لەوجـۆرە مـۆڵەت دەدریت ، هەرچەند لەلایەن خەڵکانی پسـپۆرەوە لە ( مافیا ) و بازرگانەکـان واتە ئەتـوانین بڵیـین کە هەمـوو ئافرەتیکی هاتووی دەوڵەتانی جیهانی سیهەم توانای هاتوچۆ و کۆچکردنیان هەیە بە ئەوروپـادا بە مەرجیـك توانای کارکردنیان هەبیـت لە بـواری سیکسـیدا . لەو کەس و دەزگایانەی کە بەهۆی گەشـتوگوزارەوە و لەو ریـــگەی ئافرەتـــانی ســـۆزانی دەدۆزنەوە و رەوانەی وڵاتـانی جیهانیـان ئەکەن ( نیگرمـان ) لە ئاسـیا کە ئامـــادەیە بـــۆ ریکخســـتنی گەشـــتی سیکســـی ( ســـەفاری ) لە ئەفەریقـــا و ( کـــروز ) لە کـــاریبی بازرگانیکردن بە ئافرەتانەوە بازرگانیەکی سەرکەوتوە و بازرگـانە رۆژئاواییەکـان ئافرەتـانی رۆژئـاوایی زۆر گـران لەسـەریان دەکەویـت ، لە ئیسـتادا ئەو وڵاتـانەی بە

سەرچاوەیەکی باشی ئەم بازرگانیە دادەنریت وڵاتانی تایلاند و فلیپین و کینیا و دومنیکان و بەرازیلە و لە هەشتاکاندا ئەم بازرگانیە گەشە و بەرەو پیشچونیکی بەرچاوی بەخۆوە بینی کاتیك کە ئافرەتان لە یانەیەکەوە بۆ یەکیکی تر و لە خانویەکی سیکسیەوە بۆ یەکیکی تر و لە وڵاتیکەوە بۆ وڵاتیکی تر و بەو شیوەیە ئەم بازرگانیە لە برەودابوو بەتایبەت پاش ئەوەی سنوور لە نیوان دەوڵەتانی یەکیتی ئەوروپادا نەما و هەڵگیرا ، هیچ جۆرە پشکنینیك لەسەر سنووری ئەو وڵاتانە نیە لیرەوە بازرگانی سیکسی هەڵی تەواوی خۆیی قۆستەوە ، لەلایەکی ترەوە ئاڵۆزی و شەرەنگیزی لەو وڵاتانەدا لەدژی پەناهەندیی سیاسی رودەدات بەتایبەت لە ئاڵمانیا ساڵی 1991 – 1992 کە ریگە خۆشکەربوو بۆ زیاتر رەواج پەیداکردنی ئەو جۆرە بازرگانیە ، پۆلیسی ئاسایی ئەو وڵاتانەش زۆر بە زەحمەت ئەو خەڵکانە دەدۆزنەوە ، پۆلیسی ( ئەنتەرپول ) زۆر بەکەمی کار لەم بوارەدا دەکات ، منیش زۆرم هەوڵداو داوام لەم دەزگایە کرد بۆ چاوپیکەوتن بەڵام رەتکرایەوە .

لیزا یەکیکە لە قوربانیانی گروپی یەکەمی بازرگانی ئافرەتان کە لە ساڵی ( 1981 ) ەوە چیرۆکەکەی دەستی پیکرد ، لیزا لە ساڵی ( 1955 ) لە گوندیکی فلیپینی لەدایکبووە تا قۆناغی ناوەندی خویندووە و ئاواتە خوازبووە پاشە رۆژیکی هەبیت ، دووگیان دەبیت لە پیاویکی خیزاندار ، دایکی موسوڵمان دەبیت و وەریناگریتەوە چونکە لە ئابروو چوون دەترسا

دوای ئەوەی منـــداڵەکەی دەبیـــت بە ( 8 ) مـــانگی نەخـۆش دەکەویـت و دەمریـت ، پاشـان کـابرایەکی دەوڵەمەنـــد پـــارەیەکی زۆری بـــۆ خەرج دەکـــات بە مەرجیك ببیتە خۆشەویسـتی و کـاریکی باشـی لە ( بۆتوان ) بـۆ دەدۆزیـتەوە ئەوکـات لیـزا تەمەنـی ( 16 ) سـاڵان دەبیـت ، لەسـاڵی 1981 دا ئەو کۆمپانیـایەی کـاری تیـدا دەکـرد ویـران دەبیـت و لەنـاو دەچیـت لە ئەنجـامی سـوتاندنی و لیـزا بەهـۆیەوە ڕوبەڕووی گیروگرفـت ئەبیـتەوە لەگەڵ ڕ و کاربەدەسـتانی ئەم کۆمپانیایە تاکو کار دەگاتە ئەوەی ئەم کیشـەیە بچیـتە نوسـینگەی فەرمـانبەری داد ( نسـترو بلاسـر ) کە داوای لیـدەکات وەك فەرمانبەریـك کـاری پیشـوازی بگـریتە دەسـت لای هـاوڕییەکی هۆڵەنـدی نەژاد بەناوی ( یان شـومان ) خاوەنی چەند میوانخانەیەکی پیـنج ئەسـتیرەیە و ملیـۆنیرە بە مـووچەی ( 1000 ) دۆلار واتە ( 20.000 ) پیـزۆی فلیپینـی ، لیـزا پیشـتر تەنهـا ( 420 ) پیـزۆی وەردەگـرت لەو کۆمپانیـایەی پیشتر کاری تیدا دەکردوو سـوتا ، بەڵام بەو مەرجەی هەموو مانگیك ( 20 ) دۆلار بـداتە بلاسـر ، ( بلاسـر ) لە ( 1977 ) ەوە هاوڕیی شـومانە و ژنەکەی فلیپینـی نەژادە و لە بۆتـوان نیشـتەجی بـوو ، ژنەکەی بلاسـر ناوی ( زینایـد ) بوو و دادوەربوو ، ئەو کچیکی فلیپینـی نەژاد دەکـاتە خیزانـی ( شـومان ) بەپیـیەی دادوەرە ، لەپاشـان لیـزا لەگەڵ بلاسـر دەچیـت بـۆ باڵیۆزخـانەی بەلجیکا بەڵام ( ڤیزا ) یان پی نادریـت ، دواتـر دەچـنە بالیۆزخـــانەی هۆڵەنـــدا لەوی بە چەنـــد کاتژمیریـــك

کارەکەیـــان ئەنجـــام دەدریـــت ( شـــومان ) چەنـــد وینەیەکی بلاسـر و خیـزانەکەی پیشـانی لیـزا دەدات کە لە ( شـــیقال ) دیـــن بـــۆ پیشـــوازیکردنی تـــا بیانناسیتەوە ، لە تشرینی یەکەمی 1981 دا شومان لیـزا دەبـاتە فرۆکەخـانە و پـاش ئەوەی پـارەی بلیتـی فـــرۆکەکەی بـــۆ دەدات ( 2 ) زەرفـــی پیچراویشـــی دەداتی کە یەکیکیان بڕی ( 800 ) دۆلارە و ئەویتریـان پاســـپۆرتیك و ناســـنامەیەکی ســـاختەیە لەگەڵ دانپیادانـــــانیکی ســـــاختە کە گـــــوایە لەلایەن باوکیەوەیەتی و تیایدا قایلە بەم گەشـتەی کـچەکەی و قایلیشـــە بە ئەگەری شـــووکردنی کە هەمـووی بە ناویکی ساختەوە کرابوون ، دوای ئەوەی لیـزا دەگـاتە لای شـومان و دەچیـتە ژیـر دەسـەڵاتیەوە هەسـت بە تەنگەتاوی و نا ئارامی دەکـات لە هەلسـوکەوتی ئەم ملۆنیرە ، چونکە لە هەفـتەی یەکەمـدا لە خـانوەکەی خۆی دەبیت لە ( والفیگا ) لەپاشـان دەیبـاتە دوو یـانە کە هەست دەکات هیچیان پینج ئەستیرەو میوانخـانە نین ، لەوی چەنـد ئـافرەتیکی بەرچـاو دەکەویـت بـی ئەوەی جلوبەرگی ژیرەوەیان لەبەردابیت دەسـوڕینەوە و هەندیکی تر بی جلـوبەرگ سـەما دەکەن ، لیـزا بـۆ یەکەمجاری دەبیت ئەم جۆرە هەلسـوکەوتانە ببینیـت ، کاتیـك شـــومان داوای لیـــدەکات وەك ئەوان بکـــات دەســـت دەکـــات بە گریـــان و ئەڵیـــت : دەمەویـــت بگەڕیمەوە بۆ وڵاتەکەی خۆم ، شـومانیش پیی دەڵیت : پیویسـتە کریی فرۆکە و خزمەت کردنت بـدەیت ، بـۆ رۆژی دواتـر شـومان لە ژوورەکەی خـۆی دەسـتدریژی

دەکاتەسـەر ، ئەم کارە خاڵی دەست پیکردنـی کـاری نایاسـایی و نـا شـیاوی دەبیـت لە ژیانیـدا ، پاشـان شـومان فیـری دەکـات چـۆن دژە سـیکس ( عـازل جنســی ) بەکاربهینیــت بەهــۆی شوشــەیەکەوە ، لەپاش مانگیك لە بەردەوام بوونی لەسـەر کار شومان بەزۆر دەیداتە براکەی کە کابرایەکی هیچ وپـوچە و لە شیتخانەیە ، لیـزا هـیچ ریگەیەکـی خـۆ دەربـازکردنی نابیـــت و بەردەوام دەبیـــت چـــونکە بەهـــۆی ئەم کــارکردنەیەوە شــومان پاســپۆرتیکی راســتەقینەی هۆڵەنــدی بــۆ دەرکــردووە بەڵام لیــی شــاردۆتەوە و هەرگیـــز پیشـــانی نەداوە ، یەکیـــك لەو فیـــڵ و ســاختانەی لە بــواری بازرگــانی سیکســیدا بــڵاوەو شومان پەنـای بـۆ دەبـات لە کارەکانیـدا هاوسـەریتی رووکەشــە ، ئەم کــابرایە کە خــاوەنی ( 5 ) یــانەی شــەوانەیە ســەرەتای کــارەکەی بە پروپاگەنــدە بە وینەی ئافرەتان دەست پیکرد لە رۆژنامەکاندا ، پاشان لە ســاڵی 1980 دا کاتیــك بــۆ یەکەمجــار کچیکــی فلیپینـی پـی دەگـات راسـتەوخۆ دەیکـاتە هاوسـەری هـاوڕییەکی خـۆی لە سـاڵی 1983 دا پـارە ئەدات بە کابرایەك تا ژن خوشـکەکەی خـۆی کە فلیپینـی نەژاد بوو بکاتە هاوسەری ، دواتر داوای لە کریکاریکی خۆی لە یـانەی ( میبـڵ ) کـرد بچیـت بـۆ فلیپـین و کچیکـی فلیپینی بکـاتە هاسـەری خـۆی ، ئەو کریکـارە لەگەڵ ئەوەی حەزی نەدەکــرد بەوجــۆرە ژن بهینیــت بەڵام حەزی بەو جۆرە مـۆڵەتە خـۆراییە دەکـرد ، لە هەمـان ساڵدا ( لینـدا ) ناویـك کە کچیکـی فلیپینـیە دیـتەلای

یەکســـــەر دەیکــــاتە هاوســــەری دۆســــتی ژن خوشکەکەی خۆی و لیندا راسپێردرا کە لە شارەوانی هەر پرســـپاریکیان لیکـرد بە وشـــەی بەڵــی وەڵام بداتەوە ساڵی 1985 دوو پیاوی تر دەنیریت بۆ فلیپـین بۆئەوەی ژن بهینن ، بەڵام لەوکاتەدا یاسای هۆڵەندی لەو روەوە گـــۆرانی بەســـەرداهات و ئەو کچـــانەی دەبــوونە خیزانــی پیــاوانی هۆڵەنــدی بۆیــان نەبــوو دەســـتبەجی بیـــنە نـــاو هۆڵەنـــداوە ، هەمـــوو ئەم گەنجــانەش پیویســـتیان بە پــارە بــوو کە لە هەر ژن هینانیکـــــدا نـــــزیکەی ( 5 – 10 ) هەزار فلۆرانیـــــان وەردەگــرت دەشـــیانزانی کە چاویـــان بە ژنەکانیـــان ناکەویت بەڵکو یانە سیکسیەکانی هۆڵەندا شـوینیانە .

لەم کـاتەدا لیـزا ســەرقاڵی پـارە پەیـداکردن بـوو بـۆ شـــومان و هەفــتەی ( 500 ) فلــۆرانی ئەدایە لەپاشـــان ســـك دەکـات و دەســـتبەجی پیـی لەناودەبریت ، هەندیك لە ( موشـتەری ) داوایان بەبی ( دژە سیکس ) جـووت بـبن بەڵام کـریکەی بەرزبـوو ( 400 – 500 ) فلـــۆران بـــوو پـــاش چەنـــد رۆژیـــك لە لەنـاوبردنی سـکەکەی داوایـان لیکـرد بچیـتەوە سـەر کارەکەی ، لەساڵی 1982 دا و پاش ئەوەی شـومان لیی دەدات بۆ یەکەمجـار لیـزا بریـار دەدات هەڵبیـت ، لیــزا دەگەڕێــتەوە بــۆ ( مــانیلا ) بۆهــۆی یەکیــك لە موشـتەریەکانەوە لە ماڵی ( بۆی ) کە مامۆتای کاراتیە وەك پاسـەوانی تـایبەتی شـومان کـاری دەکـرد خـۆی شـاردەوە پاش چەند رۆژیك پیاویك بەم کابرایە دەڵیـت

: شـومان بەشـوین لیزا ناویکدا دەگەڕێت چونکە پارەی لایە لیزا دەڵیت : ترسـام بمکوژیـت هربـۆیە نـامەیەکم نووسـی بۆ ژنەکەی شـومان بەڵام لە وەڵامـدا وتبـووی پیویســتە ریــزی خــۆی بگریــت چــونکە پــارەی لایە و بلیتیکی فرۆکەشـی بۆ نـاردبوو بـۆ گەڕانەوە بە بـڕی ( 7000 ) فلـــــــۆران کە بەم شــــــــیوەیە قەرزەکەی سـەرشــانی بووبـوە ســی هینــدە و نوســیبووی گەر بگەڕیتەوە زۆر شــت دەگۆڕیـت . لە ( 15 / 2 / 1985 ) دا پۆلیس دەدات بەسـەر یانەکانی شـوماندا کە تایبەت بــوون بە کــاری سیکســـی و ســـەرجەم کچەکــان دەســـتگیر دەکــرین ، بەڵام لەبەرئەوەی لە تــۆڵەی شــومان دەترســان هیچکامیــان نەیــانویرا ســکاڵای لەســـەر تۆمــار بــکەن ، لە ( 21 / 3 / 1985 ) و لەو کاتەی دادگـا سـەبارەت بە شـومان پرسـیاری لە لیـزا کــرد بە دەنگــی بەرز دەڵیــت زۆرم قــین لییەتــی لە پاشـان لە تشـرینی دووەمـدا لیـزا لای پـۆلیس سـکاڵا لەسـەر شـومان و ژنەکەی تۆمار دەکات ، کاتیکیش کە لیزا لە باخچەیەکدا دانیشـتبووە بـۆ حەوانەوە ژنەکەی شــومان دەچیـتە تەنیشــتیەوە و پیــی دەڵیـت کە بەو کـارەی ژیـانی خـۆی خسـتۆتە مەترسـیەوە و پیشــی دەڵیــت هەرچیــت بە پــۆلیس وتــووە راســـتە بەڵام پیویسـتە ئەو شـتانە لەبیر بکەیت و لە وەڵامیشـدا لیـزا دەڵیت ناتوانم لەبیرخۆمیـان بەرمەوە چـونکە برینیکـی قوڵیان لا جیهیشـتووم ، دواتر پیی دەڵیـت دوو بکـوژی بەکریگیـــراوی بەناوبانـــگ بەشـــوینتا دەگەڕیـــن و شـومانیش دوو دەمانچەی پییە و لیزاش شـومان باش

دەناسیت کە چەند بـی بەزەیـی و دڵ رەقە بەرامـبەر بە ئافرەتـانی فلیپینـی و تەنهـا وەك کەرەسـتە لییـان دەڕوانیت ، لە مانگی کانونی یەکەمی 1985 دا دوای هانـدان و پشـتگیری کردنیکـی زۆر لەلایەن لیـزاوە ( لیندا ) ش هەستا بە تۆمارکردنی سکالا ، کاتی خۆی ئەم لیندایە دایکی پینج منداڵ بـووە و شـومان گفتـی پیـداوە کە لە یەکیـك لە ژوورەکـانی میوانخانەیەکـدا بیکـاتە خزمەتکـار بەڵام پـاش ئەوەی سـاڵی 1984 دەگاتە لای شومان بۆی دەردەکەویت کە شومان ژنی هەیە و گفتی هینانەکەشی درۆ دەردەچیت هەروەك میوانخانەکەشـی تەنهـا بریتـی دەبیـت لە یـانەیەکی سیکسـی و هیچیتر ، دوای یەك هەفتە لە گەیشـتی دەکـریتە هاوسـەری کـابرایەك و مـاوەی یەك سـاڵی تەواو کـاری سیکسـی ئەکـات ، سـەرجەم ئەم ئافرەتانەش لەلایەن شومانەوە گفتی بریقەداریان پی دەدرا و دەسـتبەجیش لەلایەن ( بلاسـر ) ەوە کـاری پیویستیان بۆ ئەنجامدەدرا و لە ماوەیەکی دیـاریکراودا دەگەیشـتنە لای شـومان ، لیـزا بەپۆلیسـی وت کە زۆرجار شومان شەوانە و بەسەرخۆشـی دەستدریژی دەکـردە سـەرم و لیـی دەدام و سـەر دەدام بە میزەکاندا پارەی نەدەدامـی و ئـازاریکی زۆری دەدام و وەك ئاژەڵ مامەڵەی لەگەڵ دەکردم هەرچەند من زۆر باش بووم لەگەڵیدا بەو هیوایە خوای گەورە ئاوڕیك لە داخوازیەکانم بداتەوە .

شـومان لە دووی کـانونی دووەمـی 1985 دەسـتگیردەکریت بەڵام پـاش ( 4 ) رۆژ ئـازاد دەکریـت

دواتر هەڵدیت بەرەو ( مانیلا ) بەوهۆیەوە ماوەی دوو ساڵ کیشەکەی لە دادگا دوادەخریت و هەریەك لە ( لیزا و لیندا ) چاویان دەکەویت بە ( لینلاب ) کە دواتر دەزگایەکی تایبەتی بە دژایەتیکردنی بازرگانی بە ئافرەتانی دامەزراند .
ساڵی 1987 لیزا لە هۆڵی دادگا رەخنە لە پاریزەرەکەی دەگریت و دەڵیت من وا هەست دەکەم کە تاوانبار بم ، دوای ئەوە من لەگەڵ لیزا و لیندا چووم بۆ فلیپین تا ئەو فیلمە بەڵگەنامەییە ببینم کە لەسەر بازرگانیکردن بە ئافرەتانەوە لەژیر ناوی ( Cannot run away ) دابوو ، لەماوەی گەشتەکەماندا لیندا و لینلاب شوینە نویکەی شومانیان پیشاندام کە بریتی بوون لە دوو یانەی نوی لە ناوەندی شاری ( مابینی ) کە بە هاوکاری بلاسر کردبوونیەوە ، پاشان لیزا بڕیاریدا بجەنگیت و لە چاوپیکەوتنیکدا لەگەڵ رۆژنامەکاندا وتی : من پیشتر دەترسام و هەمیشە دەگریام بەڵام ئیستا توانیومە دەست بگرم بەسەر هەستەکانمدا و خۆراگربم و بجەنگم نەك لەپیناو تۆڵە کردنەوەی خۆم بە تەنها بەڵکو لەپیناو هەر ئافرەتیکی تووش بوو و گیرۆدەی وەك من بەدوای ئەم جۆرە کەسانەوەم ، لەپاشان بەهۆی پەستانیکی زۆری رۆژنامەنووسان و کاربەدەستان لە دەزگای کۆمەڵەی دژایەتیکردنی بازرگانیکردن بە ئافرەتان دادوەر (H.S) بڕیاریدا بچیتە مانیلا تا چەند پرساریك لە هەریەك لە شومان و بلاسر بکات لەپاشان ، دواتر بلاسر تاوانبار دەکریت و

دەدریــتەوە وڵاتەکەی و لە کاتەکــانی دادگــاییکردنی سەرشیتانە هەڵسوکەوتی دەکـرد ، لە دانیشـتنیکی دادگادا دەڵیت : ئەو ئافرەتانە زۆریان لی نەکـراوە و بە ویســت و خواســتی خۆیــان ئەو کارانەیــان کــردووە و هەروەك هەریەك لە لیندا و لیزا پیش ئەوەی بینە لای من کاری سیکسـیان کـردووە ، هەرچۆنیـك بیـت لە ( 26 / 5 / 1988 ) دا تاوانبـــار دەکریـــت بە تـــاوانی دەستدریژیکردنە سەرئافرەتان و بازرگانیکردن پییانەوە بە ( 3 ) ســاڵ زینـدانی کە ئەمە بۆخـۆی مـاوەیەکی کەمە بە رەچـــاوکردنی ئەو کـــارانەی ئەنجامیـــداوە ، لەلایەکــــی تــــرەوە لەو کــــاتەی دادوەر داوا دەکــــات پاریزەرەکەی لیزا بـی دەنـگ بیـت شـومان هەلـی بـۆ دەرەخسیت چەند قسەیەك بکات وەك بەرگریکردنیـك لەخۆی و هاوکات برینـدارکردنی لیـزا بەوەی ئەڵیـت : من بڕوا ناکەم ئەو قسانەی لای پـۆلیس لەســەر مـن کراوە قسەی لیزا بن چونکە لیـزا کەسـیکی هەســت ناسك و خانومانە و ئەو قسانەش زۆر ناشرین و رەقن بۆیە بڕوا ناکەم قسەی ئەوبن . لەم کاتەدا ( شـاهید ) ە کانی پشتگیریان لە قسەکانی شومان کردوو وتیان : کە ئەو ئافرەتــانە پەپــولەی دایەنگــان و چــۆلەکەی خۆشــین و ئەوان بـڕوا نـاکەن کە ئەم کـچە منـداڵانە قسەی لەو جۆرە بکەن چونکە زۆر ناسکن .

لە ( 4 / 7 / 1990 ) دا لیزا دوای گەڕانەوەی لە مانیلا و کۆتــایی هــاتنی کیشــەکەی لەگەڵ بلاســـردا بۆیەکەمجـــــار لە کــــۆنگرەیەکی ئەوروپیــــدا کە لەلایەنکـۆمەڵەیەکەوە لە ( ئەمســتردام ) بەســترابوو

سەبارەت بە بازرگانی ئافرەتان وتی : من هەستم دەکرد تەلاری دادگا بەسەرمدا دەروخاو جەستەمی دەبوو بەژیرەوە ، دەترسام کە دوا ئەنجامی کیشەکە ئەو ئافرەتانەی بونەتە قوربانی بترسینیت ، حکومەتی وڵاتەکەم زۆر سستە لەرووی پشتگیری کردنم و بۆ کیشەکەش یاساکەی گەندەڵە ، جیهانی سیهەم هەموو ساڵیك چەندین قوربانی تۆمار دەکەن لە ئەنجامی نالەباری باری ئابووری و تاوانی جیهانی و گەندەڵی و هەڵەی گەورەی بەرپرسان . کۆتایی هاتنی کۆنگرەش بە بڕیاردان لەسەر پیویستی بنیات نانی تۆریکی جیهانی بوو ، ئەوکات هیچ جۆرە هاریکاریەك نەبوو لەنیوان سەرجەم ئەو کۆمەڵانەی دژی بازرگانیکردن بە ئافرەتان کاریان دەکرد بەشیوەیەکی راستەوخۆ یان ناراستەوخۆ ، لەم کۆنگرەیەدا بە سەدان لە بەشداربوان لەسەرجەم دەوڵەتە ئەوروپیە رۆژئاواییەکان ئامادە بوبوون .

قۆناغی دووەم لە جەنگەکەی لیزا بەرزکردنەوەی داوایەکی یاسایی بوو لە دژی ئەو پیاوەی لە ( بۆتوان ) فرۆشتی ، ئەم کیشەیە لە کیشەکەی هۆڵەندا ئاڵۆزتربوو ، ( بۆتوان ) دەکەویتە دورگەیەك بەناوی ( میندانا ) کە ململانیی سەختی تیدا لە نیوان سوپا و شۆرشگیرانی شیوعیدا ، زۆرجار ئەم ناوچەیە روبەرووی بۆردومان دەبوەوە ، ( بلاسر ) بەهۆی ئەوەی فەرمانبەری دادی بوو و ژنەکەشی دادوەر بوو لەو شارەدا ریزیکی تایبەتی هەبوو خەڵکی وایان دەزانی بلاسر هاوکاری کچانی فلیپینی دەکات بۆ

هاوسەری بەستن لەگەڵ پیاوانی بیانیدا ، بلاسر پیش ئەوەی تاوانبار بکریت بە ڕەسمی چەند نامەیەکی ئاراستەی دادی هۆڵەندی کردبوو دەربارەی لیزا ، بلاسر بڕوای تەواوی وابوو کە دەزگایەکی هۆڵەندی هاوکاری شۆڕشگێڕانی شیوعی دەکات لە وڵاتەکەیدا ، ئەو دەزگایەش جوڵانەوەیەکی ئافرەتانی فلیپینیە بەناوی ( گابریلا ) . کاتیك سەرۆکی فلیپینی ( مارکۆس ) لەسەر کورسی دەسەڵات دوردەخریتەوە لەلایەن گەلەوە دەسەڵات دەدریتە دەست سەرۆکیکی ئافرەت بەناوی ( ئەکینۆ ) ئەم سەرۆکە پشتگیریەکی تەواوی جەماوەری دەبیت وەك سەرەتای پاکسازیەکی حکومەتی دیکتاتۆری پیشوو ، ( بلاسر ) لەسەر کارەکەی لادەدریت لە ئەنجامی پەستانی جوڵانەوەی ( گابریلا ) ی پشتگیریکار لە کیشەکەی لیزا ، کە دواتر لە ( 20 ) ی تشرینی یەکەمی ساڵی 1987 دا بڕیاریدا سکاڵا لەسەر بلاسر تۆمار بکات و بلاسریش دەستبەجی ( 9 ) پاریزەری بۆخۆی ئامادەکرد و پیش هەموو شتیك داوا بەرزکراوەکەی هەڵپەسارد لەپاشان لیزا پەنا دەباتە بەر ئەو پیاوەی جیگەی بلاسری پی سپیردراوە و بڕیاری دابوو لە ( 27 / 7 / 1988 ) دا داواکەی لیزا بگەیەنیتە دادگای باڵا لە بۆتوان ، بەڵام پاش چەند هەفتەیەك لەلایەن پاریزەرەکەی بلاسرەوە هەرەشەی لیکرابوو ، شوفیری پاریزەرەکەی بلاسر دانی بەوەدا نا لەم دواییانەدا کە

بلاسر و پاریزەرەکەی پیلانی کوشتنی ( بلانساغ ) یان کیشابوو .

ئەم پاریزەرە لەساڵی 1989 دا دەستگیردەکریت لەپاشان بەهۆی دادوەر ( زینابید ) ی هاوسەری بلاسرەوە بە بارمتە ئازاد دەکریت ، کیشەکەی لیزا زۆر دواکەوت لەبەر دوو هۆ ، هۆی یەکەم کوژرانی ( بلانساغ ) بوو ، هۆی دووەم سەرۆکایەتی دادگا لە ئەنجامی گۆرانکاریەکەوە دەکەویتە دەست ( زینابید ) ، لە ( 25 / 5 / 1989 ) دا لیزا داوا دەکات دادگا لە بۆتوان بگوازریتەوە بۆ مانیلا بەهۆی هەست کردنی بە نائارامی .

لە ( 6 ) ی حوزەیراندا دادگا دەگویزریتەوە بۆ دادگای باڵا لە مانیلا لەم کاتەدا بلاسر داوایەك لە دژی لیزا بەرز دەکاتەوە بە تاوانی ساختەکاری لە بەڵگەنامەکانیدا کە پیشتر خۆی بۆی ئامادەکردبوو بە مەبەستی کۆچکردنی بۆ هۆڵەندا بەم هۆیەوە لیزا دەستگیردەکریت و ناچار باجی سەرپیچیەکەی دەدات ، لە تشرینی یەکەمی 1989 دا دادگیی لەو کیشەیەدا لە مانیلا دەستی پیکرد و بلاسر هەوڵیدا دوای بخات بەڵام لەبەردەم رق ئەستوری لیزادا هیچی پی نەکرا ، لیزا چاوی کەوت بە پاریزەریك بەناوی ( سامانتا ) کە لە کۆمەڵەی یەکگرتووی پاریزەرانی پرۆتستانت بوو ، ئەم پاریزەرە وتی : بلاسر ریکی زۆری لە ئافرەتانی ناردووە بۆلای ( شومان ) پاش ئەوەی بەڵگەنامەی پیویستی کۆچی بۆ ئامادەکردوونو لەپاداشتی ئەم کارەیدا

بلاسـر چەنـد دیـاریەکی وەرگرتـووە ، دادگـاییەکە تـا بەهاری 1990 ی خایاند و لەم کاتەدا بەرپرسـی دادگا بەهـۆی بەرزکـردنەوەی پـلەی یاسـایی دادگـا جـی دەهیڵیت و دادوەریکی دیکە دیـتە جیـی و بە ناچـاری دادگاییەکە دوادوخریت بۆ حوزەیران .
لە ( 19 / 4 / 1991 ) دا دادوەری سـێیهەم کە هـیچ ئاگایەکی پیش وەختی لە کیشـەکە نەبوو دەسـتیکرد بە پیداچونەوەی کیشـەکە و بڕیـاردان لەسـەری بەڵام چـۆن بڕیاریـك کە گورچـك بڕبـوو ، بیـئەوەی هـیچ بەڵگەیەکي سـەلمینراو لەبەرچاو بگیریت بلاسر بەبی تاوان لەقەڵەم دەدریت و ئازاد دەکریت لیـزا پڕ بە دەم هاوار دەکات ئەمە راست نیە و بگرە فـایلی کیشـەکە کە خـۆی لە ( 16 ) پەڕە دەدات لیـزا رەخـنەی لـی دەگریـت لەسـەر ئەوەی لە فیلمـی بەڵگەنـامەیی ( Cannot run away ) دا رۆڵی پاڵەوان دەبینیـت ، لە رۆژنامەکاندا ئەو دەزگـایەی پشـتگیری لە لیـزا دەکـرد ئەم ئەنجـامەی بە سـەرکەوتنی لیـزا نـاوبردوو جوڵانەوەی ( گابریلا ) ش لە رۆژنامەکانـدا نوسـیبووی کە ( ئەمڕۆ دادگا بڕیاریکی وایـدا کە وەك پشـتگیری و هاندانیکی سـەرجەم ئەو ئاژەڵانەیە کە دەستدریژی و بازرگـانی بە ئافرەتـانەوە دەکەن ) هەردوو دەزگـای پشـتگیرکەر لە لیـزا دەسـتیان کـرد بە ریکخسـتنی خۆپیشاندان لە دژی بڕیاری دادگا و پیویستی دووبارە پیـداچونەوەی بەهـۆی ناپـاکی ، بەڵام ئەو لیـزایەی ماوەی ( 6 ) ساڵ لە ململانیـدا بـوو بە تەواوی خۆیـدا بە دەستەوە و ئاڵای سپی هەڵکرد .

# بەشی پینجەم
## دەوڵەتانی سەرەکی لە ناردنی ئافرەتان لە جیهانی سیهەمدا

یەکەم / پارەدان لەسەر سەماکەرانی پینفینیدۆ :
( سەنیور – پینفینیدۆ ) قژیکی زۆر ، سورفل ، قەڵە و پیسوپۆخڵ ، عەینەکیکی لەچاودا بوو ، بەڵام باوەشی بۆ گرتمەوە و پیشوازی لیکردم کاتیك وتم بازرگانی سیکسیم و هاتووم ( 6 ) سەماکەری دومنیکی بکڕم ، ناوی ئەم کابرایەم لە دەفتەری تەلەفۆنی ڕیکی هونەری ئەڵمانی نەژاددا بەرچاو کەوت لەکاتی دەستگیرکردنیدا لەلایەن پۆلیسەوە ، ژمارەیەکی لەگەڵدابوو ، ناوەکەی لە ژمارەی تەلەفۆنی چاپخانەی ( ئەستریلا ) ی دەکرد ، بەڵام لە پشتی ئەم چاپخانەیەوە یانەیەکی بچووکی پیسی لیبوو کە پینیفینیدۆی ناسراو بە ( بیرۆ ) لی دادەنیشت دوای ئەوەی دانیشتم بیرۆ وینەی کچەکانی پیشاندام بی جلوبەرگ ، بە جلوبەرگی ژیرەوە ، لە ئەنجامی نمونەی لە جۆری ئەم کابرایە وڵاتەکەی بۆتە یەکەم وڵات لە ناردنی ئافرەتانی سەماکەر بۆ جیهان بەشیوەیەك کە ئافرەتانی دومنیکانی زۆرترین ئافرەتانی سۆزانی پیك دەهینن لە سویسرا و بەلجیکا و ئیسپانیا و دەوڵەتانی تری ئەوروپایی .

بیرۆ پیی وتم : ئەو کچانە فیری سەما ناکەم چونکە هەموویان سەمای ( رومبا و مامبۆ ) و

کردنەوەی قۆپچەی ستیانەکانیان دەزانن ، لەپاشان هەستا بە پیاهەڵدان و بەشان و باڵی ئافرەتان و کچانی وڵاتەکەی و شانازی کردن بە جوانیانەوە .
پینفینیدۆ داوای لیکراوە هەموو هەفتەیەك گروپیکی پیکهاتوو لە ( 40 ) کچ رەوانەی ئەوروپا بکات بەتایبەت بۆ ( یۆنان ) ئیستا کە من لای دانیشتووم گروپیك گەیشتوەتە ( ئەسینا ) و هاوکات چەند گروپیکی تری هەیە لە هەریەك لە ئیتالیا و ئیسپانیا و فەنزویلا ، پاسپۆرتەکەی کە ئەمریکاییە زۆر لای خۆشەویستە چونکە ئاسانکاری بۆ دەکات لە کارەکەیدا و خۆشی خاوەنی یانەیەکی تایبەت بە خۆیەتی ، بۆ رۆژی دواتر ئەو کچانەی داوام کردبوو ئامادەی کردبوون ، منیش بەوە خۆم دزیەوە کە پیش ئەوەی بڕیاری کۆتایی لەسەر ئەم کڕینە بدەم پیویستە دوا قسەی هاوبەشەکەم لەم کارەدا وەربگرم پیویست بوو ناوی ساختەی دایك و باوك بۆ ئەو کچانە بدۆزمەوە و داوای ( ڤیزا ) بکەم لە باڵیۆزخانەی بەلجیکا چونکە گەر ناوی راستەقینەی خۆیان بیت بالیۆزخانەی دومنیکان ناهیڵیت ئەو کچانە بچنە ئەو وڵاتەوە ، بەم شیوەیە پینفینیدۆ بە هەزاران لە کچان و ئافرەتانی رەوانەی ئەوروپا و رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و باکوری ئەفەریقا و ئەمریکای باشوور کردووە ، کاتی خۆی لە ( قوبرس ) لە بەرژەوەندی ( بهادوریان ) کاری کردووە و چۆتە بازاڕە گەرمەکانی ئەوکاتە بە وتەی خۆی ( تاران و قاهیرە و دارئەلبەیزاو بەیروت ) کە بریتی بوون لە بازاڕی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە رابردوودا ، هاوکات

لەگەڵ بازرگانــانی تــایبەت و بەناوبانــگ لە هینــانی کچــانی دومنیکــان کــاریکردووە بەڵام لەم ســاڵانەی دواییدا هیڵـی قـوبرس لاوازی و سسـتیەکی بەخـۆوە بینی لە ترسی ( ئیبدز ) .
هەربۆیە قوبرس ریگە نادات کچانی باشووری ئەمریکا بچیتە ئەو وڵاتەوە، بەڵام بازرگانەکان بەردەوام کچانی دومنیکــی دەبەن بــۆ دەرەوەی قــوبرس بــۆ یۆنــان بەتـایبەت بـۆ ئەسـینا کە بازاڕیـان گەرمە و بەهـۆیەوە رۆژی ( 8 ) هەزار دراخمـای یۆنانیـان دەسـتدەکەویت کە دەکـاتە ( 1400 ) فرانکـی بەلجیکـی لە کاتیکـدا تەنها ( 2000 ) هەزار دراخما دەدات بە کچەکان .
لەپاشان پینفینیدۆ دەستیکرد بە پیاهەڵدان بە شان و بــاڵی قونســوڵیەتی یۆنــانی لە دومنیکــان کە بــی راوەستان و دواکەوتن مـۆڵەتی چـونە یۆنان دەدات بە کچەکـانی بـی ئەوەی هەســت بکـات و لیکـۆڵینەوە بکـات لەو ســاختەکاریەی لە بەڵگەنامەکانــدا هەیە ، هەروەك پیی راگەیاندم کە قونسـولیەتەکە پەیوەنـدی باشـی هەیە لەگەڵ فرۆکەخـانەدا کە کچەکـانی لیـوە دەگــویزرینەوە بـۆ ( ئەمســتردام ) و فەرمـانبەری نـاو فـرۆکەکە ســەرجەم بەڵگەنـامە و پاســپۆرتەکان لای خۆی هەڵدەگریت تا ئەو کچانە نەتوانن هەڵبین .
لە هــاوینی 1991 دا پۆلیســـی دومنیکـــی چەنـــد بازرگــانیکی یۆنــانی و قوبرســـی دەســتگیردەکات بە چەندین پیناس و بەڵگەنامە و پاسـپۆرتی سـاختەوە ، هاوکـات یۆنـانیەکی تـر دەسـتگیردەکریت لەو کـاتەی خەریکـی رەوانەکردنـی ( 10 ) ئـافرەتی دومنیکـیە بـۆ

ئەســـینا لە ریــگەی ( نیویــۆرك ) ەوە ، هاوکــات ئەم ئافرەتــــانە وەك گیرفانیــــك بەکـــاردەهینران بـــۆ گواســـتنەوەی ( کۆکــایین )، بەپیـــی لیکــۆڵینەوەی پـــۆلیس ئەم تـــۆرە تەنهـــا لە مـــاوەی یەك ســـاڵدا توانیــویەتی ( 150 ) ئــافرەت رەوانە بکــات ، پاشـــان قونســـولیەتی یۆنــانی روبەرووی ئــابروبەر بــوەوە لە ئەنجامی ئەوەی کە ڕیژەیەکی ئیجگار زۆر لە ( ڤیـزا ) ی گەشتوگوزار دەدات بە کچان تەنانەت بەو کچانەش کە تەمەنیان لەخوار ( 18 ) ساڵە .
یەکیـــك لە بازرگانـــانی سیکســـــی و ئافرەتـــان لە چاوپیکەوتنیکی رۆژنامەگەریـدا وتـی : نیـوەی کچـانی دومنیکان لە ریگەی منەوە دەچنە ئەوروپا و ژیانیان زۆر لە ژیـانی دومنیکـان باشــترە ، مـن بەردەوام دەبـم لە ناردنیـان تـا حکـومەت بەردەوام بیـت لە سیاســەتی برســـیکردن و هەژاری و بـــی نـــانی ، یەکیـــك لە خانوەکـانی تـایبەت بە کـاری سـیکس کە هۆڵەنـدی نەژاد بـوو وتـی : مـن ( 10 ) ئـافرەتی دومنیکـیم لایە کەواتە پیویستە بیانژینم . لە دوا چـاوپیکەوتنم لەگەڵ پینفینیـــدۆ ریککەوتـــین لەســـەر نرخـــی کچەکـــان و رەنگەکانیان ئەو وتی : هەریەك لە کچەکان بە ( 50 ) دۆلار بەڵام وتی پیویســتە هەر کچیـك بـڕی ( 1000 ) پیزۆ واتە ( 3 ) فرانکی بەلجیکی بدات بەخۆی نرخـی ئەو جلوبەرگـــــانەی ژیـــــرەوەی و جلـــــوبەرگی ســەماکردنەکە و ( 2000 ) پیـزۆی تـریش نرخـی ئەو بەڵگەنـامە و ناســنامە ســاختانەی بۆیـان دەکریــت ، بەڵام کاتیك سـەبارەت بە وشـەی ( کیبیتاکـا )

کە وشـەیەکی دومنیکیە پرسـیارم لیکرد کە واتاکەی ( رەهن ) دەگریتەوە وەك بتی لیهات .

ئەم جـــۆرە کـــارە واتە رەهـــن شـــتیکی بـــاوە لەم بازرگـانیەدا بەڵام بڵاوتـرینە لە دومنیکـان بازرگانـانی ئافرەتان پارەیەکی زۆر بـۆ ئەو کچـانە خەرج دەکەن بـۆ کۆچکردنیـان و خیزانەکانیـان زەویەك یـان خـانویەك رەهن دەکەن و ئەو کچە دەست دەکـات بەکـارکردن و لەم ماوەیەدا زیـادە دەچیـتە سـەر ئەو پـارەیە گەر ئەو کـچە نەیتـوانی لەو مـاوەیەدا کـاری تەواو بکـات بـۆ دانەوەی ئەو قەرزە دەســـتبەجی خیـــزانەکەی لەو خانووە یان زەویە دەردەکریت و بی ڕیوجی و پەرتەوازە دەکرین ، ئەم کارەش وایکردووە پەستانی زیاتر بچیتە سـەر ئەو ئافرەتانە و بچنە ژیر دەستی بازرگانەکان .

خراپی بارودۆخی ئـابووری وایکـردووە ژمـارەیەکی زۆر لە هاوڵاتیانی دومنیکان هەڵبین و ئەو وڵاتە جیبهـیڵن و لە حەفتاکاندا بەرەو نیویۆرك کە ئیستا بەیەك ملیۆن کـــۆچکەر دەژمیردریـــت رەو بـــکەن ، دواتـــر و لە هەشتاکاندا کۆچی ئافرەتان بەرەو ئەوروپای دەسـتی پیکرد لیکۆڵینەوەکـان سـەلماندویانە کە لە ئیسـتادا ( 12 ) هەزار ئافرەت لە یۆنان هەیە و ( 10 ) هەزاریـش لە سویســـرا و ( 7 ) یـــش لە هۆڵەنـــدا ، هەروەك کۆمـــاری دومنیکـــان بەیەکەم دادەنریـــت لە زۆری دایکـانی لاوی بـی میـرد کە هەل دەرەخسـینیت بـۆ سـەرهەڵدانی کـاری نەشـیاو ، شـەوان ریژەیەکـی زۆری ئافرەتـــان بەدی دەکریـــت لە شــــەقامەکاندا تەمەنیان زۆر منداڵ دیارە ، دومنیکـان لە هەشـتاکاندا

بە وڵاتیکی گەشتوگوزاری سیکسی ناسراوبوو کاتیك کە بە پاسـی گەورە گەورە ئافرەتـانی سـۆزانی هەفتەی دووجـار دەگەیشـتنە بەنـدەری ( پورتوبلاتـا ) کە کەشـتی گەورەی لیـیە و پـڕە لە گەشـتیارانی سـیکسـی ئەمریکـایی و گەشـتیارانی ئەڵمـانیش لە بەندەرەکانی ( پوکاشـیکا و سـوزوا ) ن و گەشـتیارانی ئیتالیش کە گرنگیەکی زۆر دەدەن بە ئافرەتـانی رەش پیسـت و پیـاوان و ئافرەتـانی کەنەدیشـی لیبـوو ، سـاڵی 1992 گەورەتـرین بـۆنەی گەشـتوگوزاری سیکسـی بـوو کاتیـك کە ئەو وڵاتە یـادی ( 500 ) سـاڵەی تیپەڕبـوونی گەیشـتنی ( کریسـتۆفەر کولومبـوس ) ی کـردەوە بـۆ ئەم وڵاتە و دۆزیـنەوەی ، پزیشـکیك کە سـەردانی ئەو وڵاتەی کردبوو پیی وتم : ئیمە یادی ( 500 ) ساڵ تیپەڕبوون بەسـەر ئەم یادەدا نـاکەینەوە بەڵکـو ئاهەنـگ دەگیـڕین بەبـۆنەی تیپەڕبـوونی ( 500 ) سـاڵ بەسـەر نەخۆشـی ( سـفلس ) دا .

ساڵی 1985 هەڵڵایەکی گەورە بڵاوبوەوە کاتیك ( 28 ) کچـی دومنیکـی خنکـان لە یەکیـك لەو پاسـانەی بازرگـانیکی سیکسـی ئامـادەی کردبـوو بـۆ گواستنەوەی ئەو کچانە بە نهینی لە دورگەی ( سان مارتان ) ی هۆڵەندی بۆ دورگەی خاتوو ( سان تۆماس ) ی ئەمریکـی ، زوربەی ئەو کچـانە لەگەڵ خیزانەکانیـان دەهـاتن بـۆ کـاری سـەماکردن لەپینـاو بژیـوی پەیـداکردن و دەسـتکەوتنی خـانویەك بـۆ نیشـتەجیبونیان .

دووەم / بـانكۆك

بـوبی بـەلجیكی و قـاچەكانی دواوەی فیـل ( پاتبونـگ ) بە یەكەم گەڕەكـی بەناوبانـگ دادەنریـت لە ( بانكۆك ) لە كاری سیكسیدا سەرجەم مـوڵكی ( لـودان پاتبونـگ ) بـوو ، بـاوكی چینـی بـووە ، سـاڵی 1964 وەك پـارچەیەك زەوی كڕیبـووی بە نرخـی ( 3 ) هەزار دۆلار بەوپیـیەی زەویەكـی بـی كەڵـكە و بـۆ كشـتوكاڵ ناشـیت ، بەڵام ئەمڕۆ مـانگی نیـو ملیـۆن دۆلاری لـی دەسـتدەكەویت بەهـۆی بازرگانـانی سیكسـیەوە ئەم شـەقامە لە شـاری بـانكۆك نازنـاوەكەی گەورەتـرین خـانووی تـایبەت بە كـاری سیكسـیە لە جیهانـدا . وەك چـۆن تایلانـد نازنـاوە سیكسیە جیهانیەكەی ( بەهەشتی سـیكس ) ە لە ئاسـیادا لەم جـۆرە بەهەشـتانە زۆرن كە سـەرجەم وەك ناوەندیكی كات بەسەر بردن وان ، لەسەردەمی جەنگـی ڤیتنامـدا ناوەنـدی حەوانەوە و كـات بەسـەربردنی یەكەكـانی سـوپای ئەمریكـی بـوون (

( R+R ) واتە ( Recreation Restand ) . کە هەر سەربازیکی ئەمریکایی بۆی هەبوو چەند هەفتەیەك بـۆ حەوانەوە هەر ( 6 ) مانـگ جاریـك لە یەکیـك لەم ( 10 ) شارەدا بەسەر بەریت کە بریتـی بـوون لە شـارەکانی ( بـانکۆك ، مـانیلا ، تۆکیـۆ ، تـایپی ، هۆنۆلولـو ، سـیدنی ، کوالالامپـور ، پینانـگ ، سەنگافورە و هۆنگ کۆنگ ) .
بەڵام لەنیوان هەموویان بانکۆك نزیکترین و هەرزانترین و چالاکترین بوو، بەشیوەیەك ساڵانە نزیکەی ( 700 ) هەزار سـەرباز رویـان تـی دەکـرد بە مەبەسـتی حەوانەوە و بەسەر بردنی پشویەکی خۆش تەنها لە تایلاند ( 50 ) هەزار سـەربازی ئەمریکـی لیبـوو کە دابەش بوبـوون بەسـەر ( 7 ) بـنکەی سـەربازیدا وەك چەنـد بـنکەیەك بـۆ لیـدانی ڤیتنـام و کەمبۆدیـا ، سـوپای ئەمریکـی هەسـتا بە دامەزرانـدی چەنـدین میوانخـانە و یـانەی خـواردنەوە و خـانووی تـایبەت بە کـاری سیکسـی ، بەم شـیوەیە ئەم کـارە وردەوردە پەرەی پیـدرا و سـەربازەکانی ئەمریکـا نەك هەر دۆلارەکانیان هینایە ئەم وڵاتە بەڵکو ( گـوڵی سـایگۆن ) یشیان هینا کە نەخۆشـی ( سفلس ) بوو .
لەپاش کۆتایی هـاتنی جەنگـیش ئەم دیـاردەیە لەزۆر لە وڵاتـانی ئاسـیادا لەبەرەو پیشـچوندابوو گەشـەی کـردوو گەشـتوگوزاری سیکسـی تیـدا بڵاوبـوەوە ، بەجۆریـك کە ریـژەی ئەو گەشـتیارانەی لە سـاڵی 1990 دا گەیشـتبوونە تایلانـد بریتـی بـوون لە ( 5 ) ملیـۆن گەشـتیار کە لە ( 80% ) یـان پیـاو بـوون .

لیکۆڵینەوەکانی حکومەتی ئەو وڵاتە ئاشـکرایانکرد کە لە ئیسـتادا ( 7 ) هەزار ئـافرەتی سـۆزانی لەو وڵاتەدا دەسـت بەکارن .
تایلانــد بە گەورەتــرین وڵات دادەنریــت کە ئافرەتــان رەوانەی دەرەوە دەکات لە جیهانی سیهەمدا ، ئیسـتا ( 200 ) هەزار ئـــافرەتی تایلانـــدی لە دەرەوەی ئەو وڵاتە کاردەکەن ، زوربەی ئەم ئافرەتانەش لە باکووری رۆژهەڵاتــی ئەو وڵاتەن کە جـوانترن . بە مەبەســتی کـــارکردن ئەم ناوچـــانە زۆر هەژارن و بە کشـــتوکاڵ دەژیــن و چانــدنی ( ئەفیــون ) یــش قەدەغەی ، تــا ئەمــڕۆش لە بــاکووری رۆژهەڵاتــی ئەم وڵاتە کــاری ناشـــیاو و لەشـفرۆشـــي حەرامكـــراوە بەڵام ئەم حەرامکردنە لە رووی کۆمەڵایەتیەوە شکستی هینا ، بەجۆریــك کە گرنگیەکــی زۆر دەدریــت بە ئافرەتــانی ســۆزانی تەنـانەت وایلیهـاتووە زۆریــك لە خیزانەکـان کچەکانیان دەدەن بەکری بۆ بەدەستهینانی ئوتومبیـل یــان ئــامیریکی گــاز ، زۆر لە باوکــانیش لە پەنــا ئەو خـانووەی بە بەرد دروسـتی دەکـات تـاکو تیایـدا بـژین ژووریکی بچـووکیش لە پـوش و قـور بنیـات دەنیـت تـا کچەکانی کاری تیدا بکەن .
بەپیی ئاماریکی ( نیرامـان ) کە دەزگـایەکە و لە دژی بازرگـانیکردن بە ئافرەتـان کاردەکـات لە ئاســیادا یەك ملیـــۆن ئـــافرەتی تایلانـــدی هەیە کە ( 8 ) هەزاریان نەگەیشتونەتە تەمەنی ( 18 ) سـاڵ ، ( 22 ) هەزاریش لە ئەوروپـا. هەروەك ( 90% ) ی پیـاوانی تایلانــدی ســەردانی یــانە و خــانووە سیکســیەکان

دەکەن ، هەرچەندە بەشیوەیەکی رەسمی ئەم کـارە لە تایلانــد قەدەغەیە بەڵام بە وتەی ســەرۆکی ئەم دەزگایە بازرگانانی سـیکسـی سـەرجەم ئەم نـاوچەیە و پۆلیسەکانیشــیان کڕیــوە ، ژاپۆنیەکــان یەکەمــین کەســانیك بــوون کە ئەم بازرگانیەیــان لە حەفتاکانــدا دروستکرد کاتیك هەستان بە سازکردن و ریکخستنی چەنــد گەشــتیکی ئافرەتــان بەرەو ( کۆریــای باشــوور و تــایوان ) پاشــان بەرەو فلیپــین و تایلانــد کەوتنەری .

لە بانکۆك دەتوانیت گەشـتیارانی سیکسـی ببینیـت کاتیــك کە بە پاســی گەورەگەورە بەرەو پیشــانگەی تــایبەتی ئافرەتــان دەچــن و لەویــش ئافرەتــان لە جامخـانەدان و هەر پیـاوەش ژمـارەی تـایبەتی خـۆی دەداتە ئەو ئــافرەتەی دەیەویــت و دەیــداتە ریــبەری گەشــتەکە و ئافرەتەکـان پـیش گەڕانەوەی پیاوەکـان دەگەنە ئەو ژوورە تایبەتــــانە کە لە میوانخانەکـــــان ئامادەکراوە بـۆ ئەم گەشـتیارانە ، دواتـر کۆمپانیاکـانی گەشــتوگوزاری ئەوروپـایی بۆیـان ئاشــکرابوو کە ئەم جـۆرە ریـگەیە لەگەشــتی سیکســی لە هەریەك لە ئەڵمانیا و دەوڵەتانی ئەسکەندناڤی هەیە ، هەربـۆیە لە یەکیــك لەو بڵاوکــراوانەی دەدریــتە گەشــتیار لە هۆڵەندا وەك ریبەریك زانیاری تیدایە بۆ گەشـتەکە و ( کانیتا خاملا ) ریکـخەری ئەو گەشـتانەیە لەسـەر ئەم بڵاوکـراوانە نوسـیویەتی ( دەســتکەوتنی ئـافرەت لە بانکۆك لە کڕینی پاکەتیك جگەرە ئاسانترە ) .

پڕی ( 5000 ) هەزار فرەنکی فرەنسی نرخی بلیتی فـرۆکە و دابەزیـنە لە میوانخـانەی ( دورشسـتر ) و هەڵبژاردنـی کچـیکە لە نیـوان ( 6 ) دا ئەمە ویـڕای ئەوەی کە شـەوانە لە نیـوەی شـەودا بە راکیشـان / قورعە دەتوانیت ئـافرەتیکی تـری زیـادە بۆخـۆت پەیـدا بکەیت . بەتەنیشـت ئەم زانیاریـانەوە لەسـەر هەمـان بڵاوکراوە زانیاری دیکە هەیە لەوانە : باوك کچی خۆی ئەکـات بە ژن لە ( 12 ) سـاڵیدا و لەپاشـان دایکـی هەمـوو جـۆرە زانیـاریەکی سـەبارەت بە رۆشـنبیری سیکسـی دەداتـی تـا توانـای هەبیـت دڵـی پیـاوان راگریت لە ( سیام ) وڵاتی زەردەخەنە .

ناوەندی راستەقینەی بازرگـانی ( یـورۆ – تایلانـد ) لە ئەڵمانیادایە ، بەشـیوەیەك لە کۆتـایی هەشـتاکاندا ( ڤیزا ) گرنگ نەبووە بدریت بە تایلانـدیەکان .. تـا بچـنە ئەڵمانیاوە ، بەڵام ئەمڕۆ لەم بوارەدا ( ژاپۆن ) لەپـیش ئەڵمانیـاوەیە ، چـونکە مافیـایی ژاپـۆنی ئەرکـی بەڕیـوەبردنی ئەم بازرگـانیەی گرتـۆتە ئەسـتۆ ، سـەرۆکی پۆلیسـی ئەڵمانی ( کابتن کوفیت ) دەڵیـت : لە پەرسـتگا بوزیەکانـدا بەهاوسـەربوونی رووکەش بڵاوە بەشیوەیەکی وا کە سـەرجەم ئەو تایلانـدیانە بە رەسمی بیت شویانکردووە کە بیگومـان ئەمە راسـت نیە . لیرە وەك چـۆن لە ( مـانی ) بە هاوسـەربوون لە ریـگەی بانگەشـەوە بـڵاوە ، کۆمپانیـا هەیە لە رۆژنامەکاندا بانگەواز دەکات بـۆ پیـاوانی ئەمریکـایی و ئوسـترالی و ئەوروپـی ئەوانەی حەز بە کچـانی تایلانـدی دەکەن بیـانکەنە هاوسـەری خۆیـان و لە

بەرامبەردا ریژەیەکی کەم لە ئاڵتون و جلوبەرگیـان بـۆ دەکەن .
سـەرتاپای جیهـان ئەمـڕۆ تایلانـد بە بەدرەوشــت لە قەڵەم دەدات ، هەر لەگەڵ ئافرەتیکب تایلاندی خـۆی دەکات بە میوانخانەیەکـدا راسـتەوخۆ چەنـد پیـاویکی سـپی پیســت دوای دەکەون پرسـیاری نرخـی لــی دەکەن ، هەر ئـــافرەتیکی تایلانـــدیش بگـــاتە فرۆکەخـــانەی ( هۆنـــگ کۆنـــگ ) دەســـتبەجی لیکـۆڵینەوەی لەگەڵ دەکریـت تـا بزانریـت سـۆزانیە ، هەروەك هەمــوو ئــافرەتیکی تایلانــدی کە تەمەنــی لەنیـوان ( 14 – 34 ) ســاڵدا بیـت پیویســتە لەلایەن وەزارەتـــی تەندروســـتیەوە بپشـــکنری ، پاشـــان پاســپۆرتی پــی دەدریـت چـونکە بە ریژەیەکـی زۆر ( ئییدز ) بڵاوبۆتەوە لەو وڵاتەدا هەروەك وا دانراوە کە تـا کۆتایی ئەم سەدەیە ریژەی هەڵگرانی ئەم نەخۆشـیە بگــاتە ( 3 – 6 ) ملیــۆن ، چەنــد ســاڵیك لەمەوبەر حکـومەت درکـی بەم نەخۆشــیە نەکردبـوو ، ( ئەدیـر کزاید ) ی وەزیر لە ساڵی 1989 دا بڕیار دەدات کە لە هەر هەریمیکدا لەو وڵاتە ناوچەیەکی زیندوو دروسـت بکریـت بە مەبەسـتی زیـاتر هانـدانی گەشـتوگوزار ، بەڵام پــاش کودەتــا لە ســاڵی 1991 دا حکــومەت خەڵکی ئاگادار کردەوە لە مەترسی ئەم نەخۆشـیە و داوایکرد لە کاتی سیکس کردندا پاریزەری سیکســی ( کۆندۆم ) بەکاربهینریت .
بەپیی وتەکانی ( بـوب ) ی بەلجیکـی کە یەکـیکە لە پادشـاکانی ئەم بازرگانیە لە ( سـکوابوی ) لە بـانکۆك

ئەوا کیشەی بڵاوبونەوەی ( ئییدز ) لە تایلاند زۆر لە قەبارەی خۆی گەورەتر کراوە بوب دەڵیت : هەموو ئافرەتیکی لای من هەفتانە پزیشك دەیانبینیت و مانگانە خوینیان دەپشکنریت من تا ئیستا حاڵەتیکی ئییدزم نەبینیوە ، لای خۆشمەوە بەردەوام هەوڵ دەدەم قایلیان بکەم کە پاریزەری سیکس بەکاربهینن یان دەرمان بخۆن بەڵام خۆیان حەز ناکەن ئەم حاڵەتە نەویستراوە لە تایلاند، بوب ژنەکەی تایلاندیە ( موشتەری ) کچان دەبەن بۆ یەکیك لەم دوو میوانخانەیە ( Short time hotel یان Curftain hotel ) هەر رۆژیك لە میوانخانەی ( گریس ) نرخەکەی ( 160 ) فرانکی فەرەنسییە ، بۆ هەر شەویکیش لە قاوەخانەی ژیر ئەم میوانخانەیە ( 200 ) ئافرەت هەیە کە موشتەری لیی هەڵدەبژیریت ، زۆربەی موشتەریەکان لە عەرەبن بە دشداشەوە وە ئەو کەسانەی زمان دەزانن و لەگەڵیاندان و ئافرەتیان بۆ ریکدەخەن دەڵین : عەرەب خۆشەویست نین لە بانکۆك و ئافرەتان لییان دەترسن لە جیگەدا ، بۆب دەڵیت : من ناهیڵم بینە یانەکەم چونکە ئەو جۆرەی ئەوان دەیانەویت لام نیە داوا دەکەن زۆر منداڵ بن ، چونکە زوربەی ئافرەتانیش لە ئەنجامی نەشتەرگەری پەردەی کچینیان بۆ دانراوەتەوە و زۆر گرانن زۆرجاریش لە کیسەیەکی بچوکدا کە لە دەمی کۆئەندامی زییدا دادەنریت خوینی ماسی دادەنریت تا موشتەری عەرەبی قایل بکریت کە گوایە ئەو ئافرەتە کچ بووە ، پیشتر شاری ( باتی ) بە قلەی دووەم دەهات لە

دوای بانکۆك لە گەشتوگوزاری سیکسی ، بەڵام لەم شارە سیکسکردن لەگەڵ تازە پیگەیشتواندا بڵاوە بە شیوازیکی تایبەتی ، چونکە بۆچوونی رۆژهەڵاتی وایە کە جوتبوون لەگەڵ تازە پیگەیشتواندا توانای سیکس پیاوان بەهیز دەکات ، هەروەك پیاوانی رۆژئاوایی وا هەست دەکەن کە لە ئەنجامی ئەم جوتبوونە خۆیان لە توشبوون لە نەخۆشیە سیکسیەکان دەپاریزن بە تایبەتی ( ئییدز ) .
هەر لەم شارەدا شتیك هەیە پیی دەوتریت هاوسەریکی کاتی واتە ئەو گەشتیارەی دیتە ئەم شارە لەگەڵ ئافرەتیکدا بە نرخیکی گونجاو ریکدەکەویت ئیشوکاری ناوماڵ و سیکس لەگەڵدا دەکات تا ماوەی مانەوەی لەو شارە کۆتایی دیت بۆیە گەر وردبینەوە و سەرنج بدەین لە کەنار دەریای ئەم شارە هەموو پیاویکی ئەوروپی گەشتیار ئافرەتیکی مناڵکاری لەگەڵدایە .
لە ( باتیاو ) ناوەندی ( بون پاستور ) کە قەشە خاتوو میشیل بەڕیوەی دەبات هەوڵیداوە کچانی ئەم ناوچەیە قایل بکات هیچ جیاوازیەکیان لەگەڵ پیاواندا نەبیت و نییە و ناشبیت ئافرەتان بە ( قاچەکانی دواوەی فیل ) لە قەڵەم بدرین هەروەك لەبیروباوەڕی بوزیدا هاتووە ، بیروباوەڕی بوزی ریگەی بە پیاو داوە چەند ئافرەتیکی هەبیت وەك دەڵیت :
گەرهاتوو مرۆڤ بە مێینە و ئافرەت لەدایکبوو ئەوە واتای ئەوەیە کە ئەو مرۆڤەی سکەکەی کردووە پیشتر تاوانیکی کردووە وەك گوناهیك کە لە بیروباوەڕی بوزیدا بە ( کارما ) ئاماژەی پی

دەکریت . ئافرەتان بۆیان نەبوو تا ساڵی 1976 هیچ پارەیەکیان لە بانکدا هەبیت یان کاربکات ، یان پاسپۆرتی هەبیت بی قایل بوونی میردی و میشیل وایکردووە کە کتیبیکی نهینی دابنیت بۆ ئەو ئافرەتانەی دەکەونە داوی بازرگانانی سیکسیەوە و لەم کتیبەدا چەند وشەیەك هەیە لەوانە ( وەك شتیك لیم مەڕوانە ، منیش وەك تۆ مرۆڤم ) .

## سیهەم / هەنگاریا

## مەملەکەتی زوبڵ لە بانکۆك و ئەوروپا

کاتیك بەرەو لای چەند سەماکەریکی بی جلوبەرگ دەرۆیشتین ( ستیڤان زوبڵ ) پیی وتم : ئەمانە هی منن ، ساڵی 1990 زوبڵ لە ( بودابست ) یانەیەکی تایبەت بە سەمای سەماکەرانی بی جلوبەرگی دامەزراندبوو کە ناو یانەکە زۆر بە شیوەیەکی ریکوپیك رازینرابووەوە مۆبیلیکی گرانبەهای تیدابوو کچانی خزمەتکاریش بە تەنورە کورتەکانیانەوە لە نیوان میزەکاندا هاتوچۆیان دەکردوو خزمەتیان دەکرد، زوبڵ بە قەڵەمیك وینەی جەستەی ئافرەتیکی کیشاو پیی وتم : بەراستی ئەم جەستانە بەنرخن ، پیشتر و لە رابردوودا مامەڵەم بە کچانی فلیپینی و دومنیکیدا دەکرد ، بەڵام ئەمانەی ئیستا سپی پیستن و ئەم ڕە هونەریە گەورەیە لە پەنجاکانەوە ئەوروپاو رۆژهەڵاتی ناوەڕاستی بە ئافرەتان دەوڵەمەند کردووە ، پەناهەندەیەکی هەنگاری لەمیژینەیە ، دوای ئەوەی شیوعیەت لە وڵاتەکەی نامینیت دەگەڕیتەوە و

پیشـــوازییەکی شـــاهانەی لـــی دەکریـــت رووخـــانی ئەوروپـــای رۆژهەڵات ئاســـانکاری بـــۆ کارەکـــانی ئەم کـــابرایە کـــردوو کۆمەڵیـــك ئـــافرەتی هەرزان بەهـــای دەستدەکەویت بە تایبەت پاش ئەوەی بە ئاسـانی ( ڤیـــزا ) دەدرا بە هەریەك لە وڵاتـــانی ( هەنگاریـــا و چیکوسلوفاکیا و پۆلۆنیا ) بە شانازیەوە پیی راگەیاندم کە لە ئیستادا سـەرقاڵی کـردنەوەی نوسـینگەیەکی نـوییە لە ( مۆسـکۆ و ڤیەننـا ) کە بە پردیکـی نیـوان ئەوروپای رۆژهەڵات و ناوەراست دادەنریت .
بەڵام ناوەندی سـەرەکی لە وڵاتـی دایـك دەمینیـتەوە کە هەنگارییایە ، لە هەنگاریا کاری سیکی پە دەگمەن دەکـــرا لە ســـەردەمی شـــیوعیەتدا ، بەڵام ئەمـــڕۆ ئافرەتانی سۆزانی لەناو میوانخانە گەورەکانـدا دەژیـن و بە پارەی قورس و بیانی نەبیت کارنـاکەن ، هەروەك ئافرەتـانی تـریش نرخیـان هەرزانتـرە و لە کەنـاری رووبـاری ( دانـوب ) دانیشـتوون و هـاوار دەکەن ( سیکس ... سیکس ) بڵاوترین جوڵانەوە لەبـواری ئەم کـارەدا نـاردنی ئافرەتـانی ئەوروپـای رۆژهەڵاتە بەرەو ئەوروپـــای رۆژئـــاوا لەم ســـاڵانەی دوایـــدا بەرەو رۆژهەڵاتـی ناوەڕاسـتیش ، بەتـایبەت هیڵـی نیـوان ( بەرلـین – بەیـروت ) ی بەناوبانـگ کە چەنـدین لە بازرگانانی سیکسی و ئافرەتان سەرپەرشتی دەکەن و زوبـڵ فراوانترین و گەورەترینیـانە ، زوبـڵ لە کۆتـایی پەنجاکانـدا نوسـینگەیەکی لە ( تورکیـا ) کـردەوە کە لەوکـاتەدا کۆمپانیـایەکی هەبـووە بـۆ نـاردنی کچـانی ئەوروپـــایی بەرەو رۆژهەڵاتـــی ناوەڕاســـت لەو

سـەردەمانەدا رۆژنامەکـان دەیاننوسـی سـەبارەت بە بازرگـانیکردن بە ئافرەتـانی بەلجیکـی و ئینگلیـزی و فەرەنسـی و هۆڵەنـدی کە دەفرۆشـرانبە بازاڕەکـانی ( الحریم العربی ) لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاسـت و بـازاڕی کۆیلەکان لە ( زنجبار ) لە ئەفەریقا ، زوبـڵ کچەکـانی دەنـارد بـۆ هەریەکە لە ( ئیـران و عیـراق و تورکیـا و سوریا و میسـر ) ، ئەوکـات پەیوەنـدی پتەوی هەبـوو لەگەڵ پادشای گەوری جیهانی سـیکس ( بهادوریـان ) لە قــوبرس کە بە دریژایــی مــاوەی ( 30 ) ســاڵ ئافرەتی بۆ نـارد ، فروفیڵـی ئەو سـەردەمەش کە لەو کچانە دەکرا هەمان ئەو فروفیڵانەی ئەمڕۆی هەمـان بازرگـانین کە بەڵـین و گفـت بە کچـان دەدریـت گـوایە وەك فرۆشــیار لەنــاو بــازاڕ و دوکانەکانــدا یــاخود وەك خزمەتکـار و بەردەسـت لە ماڵانـدا کاریـان پیـدەکەن ، بەڵام کاتیـك دیـنە سـەر دەسـتبەکاربوون خۆیـان لە یانەی شـەوانەیی و سـەماکردن و سیکس و نمایشـی جەسـتە و لەشـفرۆشــی دەبینــنەوە ، ســاڵی 1987 پۆلیسـی هەنگاری هەستا بە کـۆکردنەوەی فـایلیکی گەورە لەسـەر ئافرەتـا کە تیایـدا نـاوی زوبـڵ هـاتبوو ، فایلەکە تایبەت بـوو بەو ئـافرەتە هەنگاریـانەی زۆریـان لیدەکرا لە دەرەوە وەك خزمتکار و سۆزانی کـاربکەن ، کیشــــەکە چەنــــد شــــتیکی وەك ( فلورانســــا ) ی ئاشکراکرد کە مافیای ( کالابار ) سەرپەرشتی چەنـد یـانەیەکی شـەوانە دەکـات کە تیایانـدا تلیـاك لەگەڵ خواردنەوە تیکەڵ دەکریـت ، یـان کۆمپانیـای ( مشـکر ئاگنســـی دی ئیســـتانبول ) کە ئــافرەتیکی تیــادا

بریندارکرا ساڵی 1986 و یانەی ( شیز ماکسیم ) لە جنیف و کۆمپانیای ( بهادوریان ) لە قوبرس کە زوبڵ کاری لەگەڵ دەکرد تا مردنی ( بابا ئارتین ) .
بەڵام لە ئەنجامی ناپاکی و ناراستی حکومەتی هەنگاریاوە ئەم کیشەیەداخرا و فایلەکە هەڵپەسیردرا ، دەقی یاسایەکی هەنگاری ساڵی 1987 ی سەردەمی شیوعیەت دەڵیت : لە هەنگاریا کاری سیکسی و لەشفرۆشی نیە هەروەك لە هیچ وڵاتیکی شیوعیدا بوونی نیە ، بەڵام لەم ساڵانەی دواییدا چەندین لە یانەی شەوانە و سیکسی و خانووی تایبەت بەو کارە لەم وڵاتە کرانەوە کە زۆریان شیوە رەسمین و لەژیر ناوی بنکەی تەندروستی بۆ بەهیزکردنی توانای سیکسی کاردەکەن .

## چوارەم / غـــانا
## كۆچكردن لە غاناوە ئەشانتیسەكان شوینی كۆربوس دەگرنەوە

لەســـەر تارمـــایی چیشـــتخانەی ( تامـــاراس ) ەوە گەشتیار بە بینینی بەرزاییەكانی دەریاچەی ( ڤۆلتـا ) لە غانا چاوەكانی روون دەبیتەوە ( تامارا ) ی ( 28 ) ســـاڵ مەمـــلەكەتەكەی پیشـــاندااین و پیـــی ناسـاندین كە بریتـی بـوو لە میوانخـانەیەكی گەورە و چیشـــتخانەیەك و چەنـــد جیگەیەكـــی تـــایبەت بە خـواردنەوە و سـەماكردن لەسـەر شـیواز و سـتایلی رۆژئاوایی ، پیی وتم : ساڵی رابردوو ئیرە تەنها لمـی لیبـوو هەمـوو ئەمـانەم بە دەسـتی خـۆم بنیادنـاوە و پـارەكەیم بە ســەماكردن لە ئەوروپـا پەیـداكردووە ، پاشــان داوای لیكــردم پیـاڵەیەك قـاوە بخـۆمەوە لە نوسینگە تایبەتەكەی خۆی كە بریتی بوو لە ( بەنگلـۆ ) خانویەكی یەك نهـۆمی لەسـەر شـیوەی كـوخیكی كۆن و پەردەیەكی گەورە دەیكات بە دوو بەشـەوە لای چەپ سیســـەمیكی گەورەی ( 4 × 4 ) ی تیـــادایەو لای راستیش ئارایشتگەیەك هەناسەت تەنگ دەبیت لەبـۆن و بەرامـدا ، لە حەمـامەكەش چەنـدین ئـاوینە هەیە مـــرۆڤ بەلاوازی پیشـــان دەدات ( تامـــارا ) بە بەردەوامی چاودیری قورسایی جەستەی دەكات .

لەســـەر دیوارەكـانیش ویـنەی ( مـارلین مـۆنرۆ ) ی ئەســـتیرەی ســـینەمای ئەمریكـــی لە حەفتاكانـــدا

هەڵواسرابوو تاماراش وەك ئەو قژی رەنگ کردبوو وتی : خەڵکـی پـیم دەڵـین زۆر لە ( مـارلین ) دەچـم ، و تیشـی کە بەردەوام سـەمای ( بالسـتربتیز ) واتە ( سەمای خۆ روتکردنەوە ) ی کردووە لە ( ئەمسـتردام ) بە مەبەسـتی پارەپەیـداکردن بـۆ ئەم ئۆردوگـایەی بنیادی نـاوە ، بەڵام بڕوا بەم قسـەیە ناکریـت چـونکە ئەوروپا ریگە نادات ئافرەتیکی سەماکەری ئەفریقـایی پارەیەکی وا زۆر کۆبکاتەوە ، خەڵکی وادەزانن کە ئەم پـارانە لە ریـگەی فرۆشـتنی تلیـاکەوە کـۆکراوەتەوە ، بنیادنانی ئۆردوگـایەکی گەشـتوگوزاری لەوجـۆرە لە ( غانا ) و لە ماوەی ( 6 ) مانگدا جیگەی سەرسـوڕمانە ، بەڵام تامارا پەیوەنـدی چڕوپڕ و تونـدی هەیە لەگەڵ بەرپرسـانی وڵاتەکەی چـونکە پیشـتر بـاوکی ( کۆجۆبۆتسیۆ ) واتە وەزیر بووە هەروەك لە جیگەیەکی بەرزدا لە چیشـتخانەکەدا ویـنەی سـەرۆکی غانـا ( جیـری راولیگنـز ) ی هەڵواسـیوە ، سـەرۆك و هاوڕییەکی زۆرجار دین بۆ خواردنی ( فوفو ) .

هەروەهـا چـاوم کەوت بە وینەیەکـی تامـارا لەگەڵ ( نیلسـۆن مانـدیلا ) دا کە ئەو ویـنەی ئەوکـات لەگەڵ گرتـووە کە سـەردانی ئەو نـاوچەیەی کـردووە سـاڵی 1991 ، چیرۆکی تامارا وەك چیرۆکی ئەلیس لە وڵاتی سەرسـورهینەران وابـووە ئەم کـارەی تامـارا بـۆتە خەونی هەموو ئافرەتیکی ئەفریقایی کە هەوڵ بـدەن و خـۆزگە بخـوازن ئەوانـیش بچـنە دەرەوە و بەهـۆی سەمای فۆلکلۆریەوە وایـان لیبیـت ، لە هەمـان کاتـدا تامـارا تـاکە ئـافرەتیکە لەو بـوارەدا سـەرکەوتنی

بەدەست هینابیت و هاوکات باشترین پروپاگەندەیە بۆ بازرگانانی سیکسی ڕانی هونەری ، تامارا دەڵیت: کچانیکی زۆر دینەلام تا بیانیرم بۆ ئەوروپا بەڵام من هەرگیز ئامۆژگاریان ناکەم بچنە ئەوروپا چونکە دۆزەخیکە بۆخۆی و لەوانەشە هیچیان وەك تامارا پلەی کەسیتیان بەرز نەبیت و نەتوانن وەك ئەو بکەن .

ئەم قسەیەی تامارا جیگەی ڕوا نیە چونکە کاتیك کە چووم بۆ سەردانی سەرقاڵی مەشق پیکردنی گروپیك لە کچانی سەماکەربوو لەوکاتەی قسەی لەگەڵ من دەکرد خەریکی خواردنەوەی مەی بوو دوای ئەوەی سەری گەرم بوو پیی وتم گەر پیم بڵیی سۆزانی دەتکوژم ، لەپاشان چیرۆکی خۆیی بۆ گیڕامەوە کە سەرەتا چۆن لە یانەی ( ئەمپەسادۆر ) لە ئەمستردام کاریکردووە . تامارا وتی : ئەوکات مەمکەکانم هیندەی دوو هیلکە دەبوون ، پاشان شوومکردووە بە ڕی بانکیکی سویسری و ( 3 ) منداڵم لیی بووە بچکۆلەکەم لەگەڵ خۆیەتی و دوانەکەی تریش ناتوانن ئەڵمانیا جیبهیڵن تامارا لە هۆڵەندا و بەلجیکا و هەنگاریا کاری سەمای نمایشی جەستە و لەشفرۆشی کردووە ، ئەو دەڵیت : من وا هەست دەکەم پادشام چونکە باشترین جۆری مەیی و شەمپانیام لایە و خزمەتکارو بەردەستیکی زۆرم هەیە ، پاشان دەستیکرد بە گریان و وتی : بەڵام ئیستا پیریکی بەدبەختم ، تامارا پەیوەندی سیاسی پتەوی هەیە ( ڤیزا ) کیشە نیە بەلایەوە و

دبلۆماســـیەکانی باڵیۆزخـــانەی هۆڵەنـــدا زۆر بـــاش ئەناسیت ، رۆژی دواتر کاتیك چوومە باڵیۆزخانەی غانا هیچ جـۆرە ئامۆژگـاری و رینمـاییەکی تـایبەتبە بـوونی بازرگــانی ئــافرەتم نەبینــی ، بەڵکــو بە دیواریــك لە دیوارەکـانی ئەو باڵیۆزخـانەیەوە ویـنەی پروپاگەنـدەی ئۆردوگـای گەشــتوگوزاری تامـارام بینــی ســکرتیری سیهەمی ئەو باڵیۆزخانەیە بە توڕەییەکەوە پیی وتم : تامارا پەیوەندی توندوتۆڵی هەیە لەگەڵ فەرمانبەرانی باڵیۆزخانەی ئەڵمانیادا .

پاشـــان وردەوردە ســـەرەتای ئەم چیـــرۆکەم لا روون بـــوەوە کە لە دووری ( 30 کـــم ) لە دەریاچەی ڤۆڵتاوە نـاوچەیەك هەیە تـایبەت بە هـۆزی ( کۆربۆس ) کە هەر خیزانیك تیایدا کچیکـی سـۆزانی هەیە لە بواری سیکسـیدا کاردەکـات و هەر تیـرەیەك تیایدا نەخۆشیکی توشبووی بە ( ئیپـدز ) هەیە ، ئەم هـۆزە لەدیـر زەمـانەوە غانـا و دەوڵەتـانی دراوسـیی دەوڵەمەند دەکـات بە ئافرەتـانی سـۆزانی ، هۆکـاری ئەم کـارەش دەگەڕێـتەوە بـۆ ( دی بـو ) کە نـاوی ئەو ئاهەنگەیە ئامادە دەکریت بۆ ئەو کچانەی پـی دەگەن و تەمەنیان دەسەلمینریت کە ( 12 ) سـاڵن و توانـای سیکسکردنیان هەیە ، وە گەربیت و یەکیك لەو کچانە پیش ئەو ئـاهەنگە سـك بکـات یـان کـاری سیکسـی بکات لەلایەن هۆزەکەوە رەخنەی توندی لی دەگیریت و لەوانەشـــە ســـزا بـــدریت بەڵام لە دوای ســـازدانی ئاهەنگ و کۆتایی هاتنی هەموو شتیك ریگە پیدراوە ، تەنانەت هاوســەریتی ئەزمـوونیش کە مـاوەیەك کـوڕو

کچەکە پیکەوە دەژین و لە دواییدا پڕیار دەدەن کە ئایا هاوسەری ببەستن یاخود جیاببنەوە لەم هۆزەدا مارەیی زۆر گران و قورسە ، بەڵام هۆکاری سەرەکی دروستبوونی ئەوەی کە ئەم هۆزە بۆ خۆیان داوەتە کاری بازرگانیکردن بە کچانەوە ئەوا دەگەڕێتەوە بۆ بنیادنانی بەنداوی ( کوشبو ) کە لە شەستەکاندا دروستکراو بە گەورەترین دەریاچەی دەستکرد لە جیهاندا دەژمیردریت ، بەهۆیەوە ئەم هۆزە بەشیکی زۆری لە زەوی و زاری لە دەستدا و ناچار بۆ پەیداکردنی بژیوی پارە کچەکانیان فرۆشت .
کچانی ( کۆربۆس ) دەچنە ( ساحل ئەلعاج ) کە لە هەشتاکانەوە بە ناوەندیك ناسراوە بۆ رەوانەکردنی ئافرەتانی ئەفریقایی بەرەو ئەوروپای رۆژئاوا ، بەپیی وتەکانی باڵیۆزخانەی غانا لە ساحل ئەلعاج نزیکەی یەك ملیۆن غانایی هەیە کە ( 90% ) ی ئافرەتن و ( 70% ) یان لە بواری بەدرەوشتی کاردەکەن و تەمەنیان لە نیوان ( 13 – 14 ) ساڵدایە ، لە ماوەی ساڵیکدا لە گوندیکی غانادا ( 60 ) کەس بە نەخۆشی ( ئیبدز ) گیانیان لەدەستدا ، ئەم ئافرەتانە بە ئوتومبیلی بارهەڵگر یاخود پاس دەگویزرینەوە و بە چەند خاڵیکی پشکنینی پۆلیسی هاوکار لەو کارەدا تیدەپەڕن و پاشان بەسەر یانە شەوانەییەکاندا دابەش دەکرین بۆ کاری سیکسی ، وەك پیشتیش باسکراوە هەمووان پەڵینی کاری فرۆشیاری و خزمەتکاریان پیدراوە بەڵام شوینیان بۆ هەتاهەتایی یانەکانە و ئافرەتانیش بە سیحر و جادوو چاوترسین

کراون تا نەتوانن هەڵبێن یان دەست لەوکارە هەڵگرن ئافرەتانی ئەفریقایی و بەتایبەت غانایی پڕوای زۆریان بە جادوگەری ڕۆحەکان هەیە .
خاتوو ( مارگریت مانسا ) کە قەشەیە و تاکە پزیشکیشە لە ناوچەکەدا لە بەشی ئیبدز لە کلینکی ( سان مارتان ) کار دەکات دەڵێت : چەندینجار لەلایەن مافیای سیکسی وڵاتەکەیەوە هەڕەشەی لێکراوە و یەکێك لە قەشەکان لە ئەنجامی ئەوەی بەرەنگاری ئەم جۆرە بازرگانیە بۆتەوە گیانی لەدەستداوە ، هەروەك دەڵێت : لە ئیستادا ڕۆژانە یەکێك بەهۆی ئیبدزەوە گیان لە دەست دەدات .
ئەم پزیشکە دەڵێت : لەگەڵ ئەوەشدا کچان پاریزەری سیکس بەکار ناهێنن و پڕوایان پێی نیە ، بەڵکو پڕوایان بە ( نانا دروبو ) هەیە کە ناوبانگی گەیشتۆتە ئەوروپا و ئەم چارەسەر بە گژوگیا دەکات کە دوای تاقیکردنەوەی ئەو گژوگیایە لە تاقیگەکاندا دەرکەوت کە هیچ چارەسەریکی ئەو نەخۆشیە ناکات و تەنها ریژەی توشبوونی کەم دەکاتەوە ، ناوبراو سەرۆك هۆزی ( کوماسی ) یە پایتەختی ( ئەشانتیس ) کە گەلیکی بەناوبانگن لە بازرگانی کاڵاو شمەکدا و لە کۆربۆس بازرگانی ئافرەتان فیربوون و ئیستا ناوبانگیان لەو بوارەدا زۆرە و ئافرەتانی رەش پیست رەوانەی وڵاتەکانی ئەڵمانیا و فەرەنسا و بەلجیکا و هۆڵەندا دەکەن و کە نەك هەر کاری سیکسی دەکەن بەڵکو پیسترین کارە ناشیاوەکان ئەنجام دەدەن و نرخیشیان زۆر هەرزانە .

ســـاڵی 1991 ( ماتیلـــدا بـــابۆ ) لیکـــۆڵینەوەیەکی ئەنجامدا لەسەر ئەو ئافرەتانەی غانـاییین و لە ئەوروپـا دەژیــن ، دوای چەنــدین چــاوپیکەوتن و ســۆراخکردن گەیشتە ئەم ئەنجامە : سی بەشی ئەو کچانە پیش گەیشتنیان بۆ ئەوروپا کـاری نایاسـایی و سیکسـیان کردووە ، سی یەکی تریان تـا نەگەیشـتونەتە یـانەکە نەیانزایوە بەرەو کوی و بـۆچی دەچـن ، ســی یەکـی کۆتاییش پڕوای تەواویان هەبـووە کە ببـنە هاوسـەری راســتەقینە و کـاری پـاك و یاســایی ئەنجـام بـدەن ، هەروەهــا بــۆی ئاشـــکرابووە ئەوانەی ئەم بازرگــانیە بەڕیــوە دەبەن غانــایی رەچەڵەکــن یــاخود خۆیــان بەدرەوشت بوون و ئیستا بونەتە پسـپۆڕو بازرگـان لەو بوارەدا ، بەڵام لە ئیستادا زۆرترین ئافرەتانی سۆزانی لە هۆزی ( ئەشانتیس ) ە .

نەبــوونی و داروخــانی ئــابووری نــاوچەکە هۆکــاری سەرەکی بووە لەجیهیشتنی غانا و رەوکـردن بەرەو ( نایجیریـــا ) دواتـــر ئەوروپـــای رۆژئـــاوا پـــاش ئەوەی حکومەتی نایجیری دووری خستنەوە بۆ سەر سـنوور کە دواتـــر بە فیلـــی پەناهەنـــدیی سیاســـی یـــان هاوســـەری رووکەش خۆیـــان دەکـــرد بەو وڵاتەداو دواتـریش ئەو ئـافرەتە خـۆی بە ( تەڵاق ) دان دەدا و میـردی راســتەقینە و خیـزانەکەی رادەکیشـا بـۆلای خۆی .

بەم ریـــگەیە ( 5 – 100 ) کەس دەگـــاتە ئەڵمانیـــا ، باڵیۆزخانەی ئەڵمانیا لە غانا ساڵانە ( 2500 ) حاڵەتی هاوســـەری رووکەش تۆمــار دەکــات ، بەپیــی وتەی

بەرپرسـیك لەو باڵیۆزخـانەیە ئەوا ( 90% ) ی ئەم هاوسـەرییە بـۆ ئافرەتـانی سـۆزانیە کە بـۆ کـارکردن بەرەو ئەوروپا دەڕۆن .

( لیندا ) ئافرەتیکی رەش پیستە و ماوەی ( 6 ) مانگ کاری بەدرەوشتی کردووە لە ( فرانکفـۆرت ) و ئـاواتی ئەوەیە کە میردیکی ئەوروپایی راستەقینە پەیـدابکات ، پیی وتم : پیاوانی ئەوروپایی حەزیـان لە ئافرەتـانی رەش پیسـتە چـونکە توانـای باشـتریان هەیە لە بەڕیوەبردنی ماڵ و خیزان هەر وەك ئەزانن چۆن دڵـی پیاو رادەگرین و ئیمە گەرمتـرین لە سـپی پیسـتەکان لە جیگەدا .

## پینجەم / مانیلا
## عەمباری ئافرەتان لە مانیلایە

لە فرۆکەخانەی مانیلا حەماڵەکان وینەی رەنگاورەنگی ئارایشتگەکانی تایبەت بە ئافرەتانی سیکسیان پییە کە لەودیوی جامخانەوە بەبی جلوبەرگ هەریەك ژمارەی تایبەت بەخۆیی بە سنگەوەیە وەك ماسی ناو حەوز ، شۆفیری ئوتومبیلی تاکسیەکە یەکیك لەو وینانەی بە پەلە دامی و پیی وتم : رۆژانە بە نرخی ( 80 ) دۆلار خۆشترین ژوور لە میوانخانە و ناسکترین و منداڵترین کچت دەست دەکەویت تەمەن ( 18 ) ساڵ .
گەرەکی ( مابینی ) لە مانیلا بەناوبانگترن گەرەکی گەشتوگوزارە کە تیایدا گلۆپە نیۆنەکان بەپیشی میوانخانەکانەوە بەشەوارەت دەخەن ، میوانخانەی خۆشەویستی و گەشتی سیکسی ، دەنگی مۆسیقای بەرز لە هەموو لایەکەوە دەبیستریت و هەر ( 50 ) مەتریك کلینکیکی نەخۆشیە سیکسیەکانت چاو پیدەکەویت ، گەشتیار هەست دەکات پادشایە هەموو شتیکی پیشکەش دەکریت ، لەم شارەدا دایکان دەبینیت بە منداڵەکانیانەوە بەدوای موشتەریدا دەگەڕێت ، هەروەها ریژەیەکی زۆر لە گەشتی سیکسی و سەمای نمایشی جەستە و کاری

سیکسی لەگەڵ منداڵاندا و بازرگانی بە ئافرەتانەوە هەیە .
ئیوارە لە باخچەی ( لۆنیتۆ ) کچانی منداڵ و هەرزە دەبینیت خۆیان دەشۆن و بەشوین موشتەریدا دەگەڕین گەر دەستیان نەکەوت لەسەر جادە و لە کەلاوەکاندا دەنون ، لە مانیلا ( 20 ) هەزار منداڵی کوڕوکچ کاری بەدرەوشتی دەکەن کە سەرجەم دراونەتە بازرگانەکان ، فرۆشراون لەلایەن خیزانەکانیانەوە یا خودی خۆیان هەڵهاتوون و هاتونەتە ئیرە بۆ پارە پەیداکردن .
( فلیپین و سریلانکا ) لە پیشەوەی ئەو وڵاتانەن کە کاری بەدرەوشتی منداڵانی تیدا بڵاوە لە بازاڕەکانی سیکس و جیهانیدا ، لە ئەڵمانیا و ئوسترالیا و ئەمریکا گۆڤاری تایبەت بە وینە و زانیاری منداڵانی لە کچانی فلیپینی تیدایە هەیە و بڵاوە ، زۆر لە بازرگانەکانی سیکس و ئافرەتان جی و ری بۆ ئەم منداڵانە پەیدا دەکەن یاخود دەیانخەنە بەر خویندن بە وتەی خۆیان گوایە بۆ ئەوەی ویژدانیان ئازاریان نەدات ، بەم ریگەیەش هاوکاری چارەسەرکردنی کیشەی هەژاری لە فلیپین دەکەن و منداڵان دەژیەنن .
( 250 – 500 ) هەزار لە کچانی هەرزە وەك ئافرەتی سۆزانی کاردەکەن ، بەڵام ئەو ناوە رەسمەیەی دەوڵەت لەم کچانەی ناوە کە لەو بوارەدا کاردەکەن ( کچانی میوانداری ) بە لەژیر سیبەری فەرمانڕەوایی ( مارکۆس ) دا وڵات بڕیاریداوە گەشتوگوزاری سیکسی پەرەی پی بدریت و کچانی هەرزە دەدات

لەپینــاو پڕیــك پــارەی بیــانی قــورس و بەم جــۆرە لە هەردوو ســـەر بازرگـــانیەکە گەرم دەبیـــت ، پیـــاوانی ســپی پیســتی دەوڵەمەنــد دیــنە مــانیلا و فلیپینــیە هەژارەکانیش بەرەو رۆژئاوا کۆچ دەکەن .

مانیلا پایتەختیکی چڕ و بـۆگەنە خەڵکـی دەمامکیـان بەستووە تا بەهۆی پیسـی ئـاو وهەوای ژیـنگەکەیەوە نەخۆش نەکەون ، لەلایەکی ترەوە بە دەیان هەزار لە خەڵکـی لە چیـای دوکەڵ کە ئەو نـاوچەیەیە خـۆڵ و خاشـــاکی شـــاری لـــی کـــۆکراوەتەوە کـــاردەکەن و دەگەڕیـن قتـوە بەتـاڵ کـۆدەکەنەوە و دەیفرۆشــنەوە ، لەنیـوان سـاڵانی ( 1970 – 1980 ) ریژەیەکـی زۆر لە پیـــــاوانی فلیپـــــین بەرەو رۆژهەڵاتـــــی ناوەڕاســـــت کۆچیـــانکرد بە مەبەســـتی کـــارکردن ، بەڵام ئیســـتا ئەوەش کەمبۆتەوە بەهۆی تەواوبوونی کاری بنیادنـان لە زوربەی وڵاتە عەرەبیەکاندا ، لە ئیستادا کۆچکەران ئافرەتانن ئەوانەی سەرۆك ( کۆرازۆن ئەکینۆ ) هانیدان و بە پاڵەوانـــانی گەل نـــاوی بـــردن کە بـــریتین لە خزمەتکار و بەردەستی ماڵان .

لە ( هۆنگ کۆنگ و سـەنگافورە و ئیتالیـا و ئیســپانیا و ئەنگلتەرە ) لە ( 80% - 100% ) ئافرەتـانی فلیپینی کاری بەردەستی و خزمەتی ماڵانیان گرتـۆتە دەســت باریــان خــراپە چــونکە پشــووی هەفتەیــان وەرنـاگرن و شـەو ورۆژ داوای کـارکردن دەکەن و هـیچ ریزیـك لە خواســت و داواکانیـان ناگیریـت و لە زوربەی دەوڵەتانـــدا روبەرووی هەرەشـــە و دەســـتدریژی سیکسـی دەبنەوە ، وە گەر بیت وسـکاڵا بـکەن بەنـد

دەکرین و دەستبەجی دەدرینەوە وڵاتەکانیان بۆ نمونە وەك لە ( سعودیە ) روو دەدات . وایلیهاتووە وشەی فلیپینی بەرامبەر وشەی خزمەتکار و هاوسەربوونە بە پلەی یەکەم فلیپینیەکانن بە رۆژئاوا دەفرۆشرین ، دیاردەی داواکردنی هاوسەر بە پۆست کاتیك دەستی پیکرد کە ئەمریکا یاسای هاوسەری جەنگی لە ساڵی 1964 دا پەیڕەوکرد ، تەنها لە ماوەی ( 4 ) ساڵدا ( 14 ) هەزار هاوسەری جەنگی زەریای پڕی ، ریژەیەکی زۆر لە بڵاوکراوە و رۆژنامەکان پروپاگەندەی هاوسەری فلیپینی تیدایە لە ئوستراليا و ئەڵمانیا و ئەمریکا لە فلیپین کۆمپانیایەکی تایبەت بە هاوسەریگرتن ساڵی 1990 قەدەغە کرا بەڵام لەژیرەوە و بەنهینی و بە ساختە کارەکە هەر بەردەوام بوو ڕیکی نوسینگەیەکی بەهاوسەربوون لە فلیپینیەکان لە ( برۆکسل ) پیی راگەیاندم کە ئافرەتانی بەلجیکایی باش نین چونکە دەرمان دەخۆن هەروەك دڵسۆزنین بۆ میردەکانیان ، دەبینیت لە داهاتوودا بە زەحمەت میردیان دەستدەکەویت و لە ساڵی ( 2000 ) بە دواوە پیاوان داوای ئافرەتی ئاسیایی دەکەن .

ئەمە بۆچوونی یەکیك لە بازرگانەکانی ئافرەتانە بەرامبەر بە دوارۆژ و داهاتوو هەربۆیە ئەم ( فەلسەفە ) یەی وایلیکردم لیرەدا لیکۆڵینەوەکەم رابگرم .

